

چاپی دووەم

# ناوی تۆ
# ئیمزای منە



تەلعەت تاهیر





دەزگای فام

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری





چاپی دووەم - ٢٠٢٢


# ناوی تۆ ئیمزای منە

نووسینی

## تەڵعەت تاهیر


بابەت: شیعر

پێوانە: ١٣.٥*٢١سم (٤٠٠) لاپەڕە

مۆتیف: هونەرمەند قەرەنی جەمیل

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٦٤)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆك

ناوەڕۆك ........ ٥

تەڵعەت تاهیر لە ئەزموونێکی بێهاوتا و جیهانێکی ناوازەدا ........ ٢١

**بۆنی شیر ........ ٥٥**

زێ زێ ........ ٥٧

ستایش ........ ٥٨

ئادەم ........ ٥٩

باتە ........ ٦٠

چوارچێوە ........ ٦١

قوربانی ........ ٦٢

بۆنی شیر ........ ٦٣

فرمێسک ........ ٦٤

هابیل ........ ٦٥

میهرەبانی ........ ٦٦

باسکە ........ ٦٧

ڕەشەبا ........ ٦٨

نووح ........................................................................................ ٦٩

حەزێک بەردەوام دێتە دی .................................................... ٧٠

ئاوڕدانەوە.............................................................................. ٧٢

**وەرزێک لە هەزار و یەک شەوە.............................. ٧٣**

هوجام سوورچی.................................................................... ٧٥

چارەنووس ............................................................................ ٧٦

ماڵ .......................................................................................... ٧٧

لە ستایشی نەوەی پێشوودا.................................................. ٧٨

دایک ........................................................................................ ٧٩

لۆکە ........................................................................................ ٨٠

خێمە........................................................................................ ٨١

هەناسە ...................................................................................... ٨٢

سەربۆیاخکراو ........................................................................ ٨٣

شێرپەنجە................................................................................ ٨٤

بەڵێن........................................................................................ ٨٥

مانگ........................................................................................ ٨٦

فەلافل...................................................................................... ٨٧

تانکی سەربان ........................................................................ ٨٨

توفاحەین ............ ٨٩

حافز ............ ٩٠

ڕیجیم ............ ٩١

ئیجه ............ ٩٢

کلیل ............ ٩٣

غەدری نووح ............ ٩٤

جەمەدانی ............ ٩٦

تەمتوومان ............ ٩٧

**بە ڕووی ئەم جیهانە ناشرینەدا جوانیت بەرز دەکەمەوە ............ ٩٩**

راپۆرت ............ ١٠١

شریتی ڕەش بۆ چوارچێوەی وێنەیەک ............ ١٠٣

دەفتەری ئەعمال ............ ١٠٥

خەندەی تەڕ ............ ١٠٦

فێل ............ ١٠٧

بیرهاتنەوە ............ ١٠٨

ڕەفە ............ ١٠٩

شکست ............ ١١٠

بارانی ڕەش ............ ١١١

میراتگری حەبیبە ........ ١١٢

دەرکردن ........ ١١٥

نواندن ........ ١١٦

خۆڕسک ........ ١١٧

تۆقرە ........ ١١٨

سەمای مەرگ ........ ١١٩

**بۆنی گوڵەهێرۆ ........ ١٢١**

ئەرییل ........ ١٢٣

در ........ ١٢٤

قەرات ........ ١٢٥

دڵەکزە ........ ١٢٦

تەوقیت ........ ١٢٧

پاسەوانی خەون ........ ١٢٨

خۆشەویستی و ترافیکی سوور ........ ١٣٠

ئەو کەسەی لە یادەوەریمدا پیاسە دەکا ........ ١٣١

دیمەن ........ ١٣٢

کولیچە ........ ١٣٣

باوەش ........ ١٣٤

شوێنی ددان ........ ١٣٥

نازم غەزالی ڕاست دەکا ........ ١٣٦

خوان ........ ١٣٧

پێشنیار ........ ١٣٩

هەوار ........ ١٤٠

خەوتووی ناو ئاوێنە ........ ١٤١

عەین ........ ١٤٢

ئاخ ........ ١٤٣

حەسوود ........ ١٤٤

بەڵگە ........ ١٤٥

لێکدانەوە ........ ١٤٦

تابلۆ ........ ١٤٧

بەراورد ........ ١٤٨

بینین ........ ١٤٩

لەززەت ........ ١٥٠

تێرنەبوون ........ ١٥١

لەرینەوە ........ ١٥٢

ئاشتەوایی ........ ١٥٣

غەدر........................................................................................ ١٥٤

نەباتی........................................................................................ ١٥٥

رامان........................................................................................ ١٥٦

گەنمڕەنگ........................................................................................ ١٥٧

مۆمی بەر هەتاو........................................................................................ ١٥٨

ئەیوب ........................................................................................ ١٥٩

مەحاڵ........................................................................................ ١٦٠

بەڵێ........................................................................................ ١٦١

خانمی هەسارەی من ........................................................................................ ١٦٢

**تۆ ئاگردانیت و خەڵکانی تر حیکایەتن.............................. ١٦٣**

شوکولاتە........................................................................................ ١٦٥

هەموو تۆن و تۆش کەس نیت........................................................................................ ١٦٦

ئاوڕ ........................................................................................ ١٦٧

خەندە ........................................................................................ ١٦٨

ڕەچەڵەک........................................................................................ ١٦٩

تونێل ........................................................................................ ١٧٠

لاپەڕە ٨٣........................................................................................ ١٧١

داگیرسان........................................................................................ ١٧٢

کچی سین ........ ١٧٣
وەڵام ........ ١٧٤
کۆنە ........ ١٧٥
هەنی ........ ١٧٦
شاری خەونەکان ........ ١٧٧
گیتار ........ ١٧٨
ئەسمەر ........ ١٧٩
پرسیار ........ ١٨٠

**قسەی کۆن لەبارەی غەریبیکردنەوە ........ ١٨١**

ئیرە ........ ١٨٣
دانپێدانان ........ ١٨٤
پۆرترێت ........ ١٨٥
تین ........ ١٨٦
بە سادەیی ........ ١٨٧
میمۆری ........ ١٨٨
تێبینی ........ ١٨٩
دەرەنگکەوتن ........ ١٩٠
مۆتیف ........ ١٩١

بەرەبەیان ..................... ١٩٢

ئۆقرە ..................... ١٩٣

خوێ ..................... ١٩٤

چەندین سەرەتا و یەک کۆتایی ..................... ١٩٥

شرووب ..................... ١٩٦

تریفە ..................... ١٩٧

توورەبوون ..................... ١٩٨

ئەو دڵەی لە جەستەمدا میوان بوو ..................... ١٩٩

وەفا ..................... ٢٠١

دەفر ..................... ٢٠٢

تەنیا مانەوە ..................... ٢٠٣

پەنا ..................... ٢٠٤

دوارۆژ ..................... ٢٠٥

بورجی گیسک ..................... ٢٠٦

**نەبووی بەوەی دەتویست ..................... ٢٠٧**

دەسکەوت ..................... ٢٠٩

شایەتی ..................... ٢١٠

یاداشت ..................... ٢١١

غەریب ........................................ ٢١٢

نادادی........................................ ٢١٣

دیانا ........................................ ٢١٤

ونکردن........................................ ٢١٥

من دیت جارا عەولی........................................ ٢١٦

دیاری ........................................ ٢١٧

پەند ........................................ ٢١٨

سڕینەوە........................................ ٢١٩

مەغریب........................................ ٢٢٠

دەنگ ........................................ ٢٢١

بە کورتی........................................ ٢٢٢

دڵدانەوە ........................................ ٢٢٣

ئەکتەر ........................................ ٢٢٤

ئەمەک ........................................ ٢٢٥

دەڵێن پیر بووین ........................................ ٢٢٦

دووان ........................................ ٢٢٧

شەوچەرە ........................................ ٢٢٨

سێبەر ........................................ ٢٢٩

دیاری نادیار ........................................................ ٢٣٠

خەتا........................................................................ ٢٣١

جیابوونەوە.................................................................. ٢٣٢

کانی....................................................................... ٢٣٣

تاتۆ........................................................................ ٢٣٤

ڕاوچی..................................................................... ٢٣٥

مێرد ....................................................................... ٢٣٦

نێرینە...................................................................... ٢٣٧

**پاییزی زەعیم.................................................. ٢٣٩**

لەبەر تاوازێک نایەوێ ببێتە گۆرانی.................................. ٢٦٥

ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبم بە خۆم............................................ ٢٧٤

بە بۆنەی چۆلەکەیەک بەسەر شانی داهۆڵەوە ...................... ٢٨١

**خۆشەویستیت بەرواری بەسەرچوونی نییە........................ ٢٨٧**

ئیمان..................................................................... ٢٨٩

فێڵ لە ناسینت ناکرێ.................................................. ٢٩٠

تاقانە ..................................................................... ٢٩٢

خۆڵەمێش.................................................................. ٢٩٣

قەفەس .................................................................... ٢٩٤

بەقەرە زاحیکە.......... ٢٩٥
متمانە.......... ٢٩٦
وانە.......... ٢٩٧
هاوکێشە.......... ٢٩٨
شەمائیل.......... ٢٩٩
شەکرە.......... ٣٠٠
زۆراب.......... ٣٠١
دلۆپە.......... ٣٠٢
جەرگم.......... ٣٠٣
سەرسوڕمان.......... ٣٠٤
سڵاو.......... ٣٠٥
مۆسیقا.......... ٣٠٦
گرتە.......... ٣٠٧
گریان.......... ٣٠٨
چرۆ.......... ٣٠٩
ئەمانەت.......... ٣١٠
شاردنەوە.......... ٣١١
نامەیەک.......... ٣١٢

چاکە ........................................................................ ٣١٣

تاڵان ........................................................................ ٣١٤

خۆزگە ........................................................................ ٣١٥

تەون ........................................................................ ٣١٦

کەشوهەوا ........................................................................ ٣١٧

گیرۆدە ........................................................................ ٣١٨

مووروو ........................................................................ ٣١٩

ترێ ........................................................................ ٣٢٠

توحفە ........................................................................ ٣٢١

بازوو ........................................................................ ٣٢٢

شایی ........................................................................ ٣٢٣

پشتێنە ........................................................................ ٣٢٤

کووران ........................................................................ ٣٢٥

مۆڵەت ........................................................................ ٣٢٦

ڕاڤە ........................................................................ ٣٢٧

بەروار ........................................................................ ٣٢٨

هودنە ........................................................................ ٣٢٩

ستارە ........................................................................ ٣٣٠

راستی ........................................ ٣٣١

داهۆڵ ........................................ ٣٣٢

گرافیتی ........................................ ٣٣٣

بەراورد ........................................ ٣٣٤

گرەو ........................................ ٣٣٥

شیر ........................................ ٣٣٦

حەسرەت ........................................ ٣٣٧

دوو بزوێن ........................................ ٣٣٨

هێزی ڕاکێشان ........................................ ٣٤٠

نوقڵ ........................................ ٣٤١

مەجنوون ........................................ ٣٤٢

پێناسە ........................................ ٣٤٣

**پەنجەرەیەکی کراوە بەسەر باخچەیەکی چۆڵەوە ................ ٣٤٥**

وڵات ........................................ ٣٤٧

ڕۆژهەڵات ........................................ ٣٤٨

کۆجیتۆ ........................................ ٣٤٩

باوەژن ........................................ ٣٥٠

جلێک بە ڕووتی ........................................ ٣٥١

پاداشت ........................................ ٣٥٢

وەسل ........................................ ٣٥٣

دەمی راپەڕین ........................................ ٣٥٤

ئاسۆ ........................................ ٣٥٥

قافیە ........................................ ٣٥٦

کۆمیدیا ........................................ ٣٥٧

خەبات ........................................ ٣٥٨

ملوانکەی ئەفسوناوی ........................................ ٣٥٩

شوکرانە ........................................ ٣٦١

شوێندەست ........................................ ٣٦٢

هاڕین ........................................ ٣٦٣

حەجەری ........................................ ٣٦٤

موتەنەبی ........................................ ٣٦٥

ئیسکان ........................................ ٣٦٦

لایلایە ........................................ ٣٦٧

تەسجیل ........................................ ٣٦٨

جادەی کاوە ........................................ ٣٦٩

مەنزل ........................................ ٣٧٠

هەڵبژاردە....................................................................................................... ٣٧١

ڕاو............................................................................................................... ٣٧٢

بووکی ئازادی ....................................................................................... ٣٧٣

تۆڵە ........................................................................................................ ٣٧٤

تامێکی دوور ....................................................................................... ٣٧٥

خەلیفە.................................................................................................... ٣٧٦

پلیکانە................................................................................................... ٣٧٨

نوێخوازی ............................................................................................ ٣٧٩

موکەبیرە ................................................................................................ ٣٨٠

لافاو ...................................................................................................... ٣٨١

پەیکەرتاش ......................................................................................... ٣٨٢

داڵ ......................................................................................................... ٣٨٣

تەشریفات ............................................................................................ ٣٨٤

میوە ....................................................................................................... ٣٨٥

شوان....................................................................................................... ٣٨٦

بیانوو ..................................................................................................... ٣٨٧

ڕیزەیی..................................................................................................... ٣٨٨

لۆچ ........................................................................................................ ٣٨٩

## تەڵعەت تاهیر

## لە ئەزموونێکی بێهاوتا و جیهانێکی ناوازەدا

سەروەر عەبدوڵڵا
بەرلین ٢٠٢٠/٤/٤

گوزەر بە نێو ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیردا لە چەندین وێستگەی جیاجیادا ڕاماندەگرێت، ئەو وێستگانەی تیایاندا گەشە بە هێڵ و ڕایەڵەکانی پێکهاتەی شیعری دراوە، تا ئەو ڕاددەیەی هارمۆنیای پنت و پۆرگ و ئەرکەکانیان لە ڕێگەی ئەو ئامراز و ئەندازەکارییە تازانەی لە بیناکاریی تێکستدا بەکار هێنراون، بگاتە ئەو ئاستەی ڕەنگدانەوەیەکی درەوشاوەتر و زیندووتر لە لایەن وەرگرانیانەوە بەخۆوە ببینن. ئەم ئەزموونە فرەلایەنەی شاعیر کار بۆ ڕەختاندنی دیزاینێکی تازەی شیعریی دەکات، دیزاینێك بتوانێت لە ڕێگەی چمکێك تەکنیکی لە بابەت ڕێسا هاوتاکان و هەماهەنگیی کایەکان و دژەکایەکانەوە، ئەرك و ستراتیژی شیعریی بپێکێنێت، ماناسازییەکانی لە ڕێگەی زار و زمانێکی ڕەوانی بێگرێوگۆڵ و چرپەدوو بێنێتە دەربڕین، زار و زمانێك وردەکارییەکانی لە دەوروبەرەکەیەوە سەرچاوەی

گرتبێت و ڕەنگدانەوەی بابەتە هاوبەشكانی نێوان دیدی شاعیر و لێكەوتەی مرۆڤەكانییەوە بێت، تا ئەو ئاستەی هاماجی گوتاری شیعری و پێكهاتەكەی جیاوازتر و ڕوونتر بێتە بەر هەست و نەستی جوانوەرگرانییەوە بەشێوەیەك بشێن لە وردەكارییەكانییەوە پتر نزیك ببنەوە و هەماهەنگیی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا بسازێنن، دواجار بكرێت ئەوپەڕی چەش لە جیهانی گوتارە شیعرییەكەی و ئێستێتیكای تێكستەكانییەوە وەربگرن، بەم پێودانگە كۆی ئەم ئەزموونەی شاعیر لە پرۆژەیەكی تاكرەو و تۆكمەدا فۆڕمێكی تازەی شیعریی كوردی دێنێتە ئاراوە، فۆڕمێك تیایدا پێكانی چەمكی جوانوەرگریی دەبێتە چەق و چەرخی بایەخی سەرەكی ئێستێتیكای شیعریی، فۆڕمێك چێ دەكات سەنگی گرنگی بە لای میكانیزمی نێردەسازیی تێكست بە ئاراستەی كۆی وەرگران و ڕۆژانەی وەرگرانەوە بشكێنێتەوە و زیندوو و كاریگەر و چالاكی بكاتەوە.

لەم ئەزموونەی تەڵعەت تاهیردا، تەكنیكی شیعری لە نەریتەكانی شیعرنووسیی كوردیی هاوچەرخ و ستروكتووری ستایلە باوەكانیدا بە ئاراستەی داهێنانی فۆرمێكی جێگرەوە دەترازێت، ئەم ترازانەش لە سونگەی گۆڕینی جێكەوتەی بایەخ لە تێكستەوە بۆ وەرگر سەرهەڵدێنێت، بەرهەمهێنی تێكستی شیعری دێت بە قەوارەی ستراتیژەكەی، دەپرژێتە ئەندازەكاریی و جێبەجێكردنی تەكنیكە شیعرییە تازەكەی، بەوەی لە پێوەر و نەخشەسازییەكانی پێشوو لابدات و تێیانپەڕێنێت یان بیانشكێنێت، شكاندنێك گوتارە شیعرییەكەی لە پرۆسەی نێردەسازیدا بە

هەموو جوانی و تازەییەکانی خۆیەوە، بێ گرێوگۆڵ و سفت و سووك لە زەین و هەڵوەستەی وەرگرانەوە خوی ببینێتەوە، بەمشێوەیە وەرگر دەبێتە سەرچاوە و لێکەوتەی بیرۆکەکانی تێکست و دواجاریش هەر ئەو وەرگرەیە دەبێتە بەهاگرتەی جوانییەکانی گوتاری شیعری و جیهانە فانتازییەکەی، کەواتە وەرگر دەبێتە پنتێکی بنەڕەتی لەم ئەزموونەی شاعیر و خولگەی سەرەکی چالاکیە شیعرییەکەی پێک دێنێت، دەرهاوێشتە ئەرێنییەکانی ئەم جێگۆڕکێیەش بە ئاشکرا لە ڕێژەی فرەوانی قبوولکردن و بەجوانوەرگرتنی تێکستەکانییەوە لە لایەن وەرگرانەوە بەگشتی بەدی دەکرێن. لێرەوە ئەم میکانیزم و ستراتیژە تازانەی لەم ئەزموونە شیعرییەی تەلعەت تاهیردا بەدی دەکرێت، دەبنە پێشدەستێکی کارەکییانە بە ئاراستەی پێویستیی پێداچوونەوەی شاعیرانی ئەم قۆناغە بە هاوکێشەی هەر سێ کایەی بەرهەمهێن و بەرهەم و وەرگری جوانییەکان لە ئەزموونی شیعرسازیی هاوچەرخی کوردیدا، ئەمەش بەو نیازەی پرۆسەی نێردەسازی لە بەرهەمهێنەوە بۆ بەرهەمگر بە بەراورد لەگەڵ ئەزموونە شیعرییە کوردییەکانی پێشوودا زیندووتر و چالاکتر بکرێتەوە بۆ ئەوەی بکرێت کاریگەریی تێکستی شیعری تۆکمەتر و کۆنکرێتتر خۆی لە ڕامانی بەرهەمگرەوە بنوێنێت و لە جوانگرییەکانییەوە ڕەنگبداتەوە و تەنانەت لە یادەوەرییان زیاتر بمێنێتەوە.

ئەگەر لە پێشوودا وێنە و حاڵەتەکانی خود و خەیاڵی بەرهەمهێنی شیعری دوور لە جیهانی وەرگرانەوە، سەرچاوەی

سەرەکیی فەزای تێکستی شیعریان پێک هێنابێت و پاشان لە گۆشەنیگای خودی بەرهەمهێنەوە بە ئاراستەی جیهانێکی ئەگەرییانەی نادیار پژێندرابێت، ئەوا لەم ئەزموونە شیعرییەی تەڵعەت تاهیردا تەواو پێچەوانەکەی بەدی دەکرێت، کاتێک وەرگر و جیهانی وەرگران بە هەموو خود و خەون و خەیاڵیانەوە دەبنە سەرچاوەی بنەڕەتی بابەت و بیرۆکەی تێکست. بەرهەمهێنی شیعری لە سونگەی جیهانبینی خۆیەوە، دێت و دەست بە دروستکردنی تێکستەکانی دەکات و دواتر لە گۆشەنیگای ئەو چرکەسات و حاڵەتە شیعرییەی، شاعیر تیایدا دەژیێت، بە زار و زمانێکی ڕەوان بەرجەستەیان دەکات و لە مۆتیڤێکدا یان لە چەند مۆتیڤێکی شیعریدا گەردانیان دەکات و بۆ وەرگرانی دەیانیگەڕێنێتەوە، کەواتە لەم ئەزموونە شیعرییەی تەڵعەت تاهیردا بە ئاشکرا جۆرە لادانێکی بنەڕەتی لە میکانیزمە شیعرییە کوردییەکەی پێشووەوە بە ئاراستەی میکانیزمێکی جێگرەوە بەدی دەکرێت، میکانیزمێک تیایدا ستراتیژی دەنگی شیعری خۆی لە گەیشتن بە ویستە چاوەڕواننەکراوەکان و جوانخوازییەکانی خودی وەرگر دەبینێتەوە، دواجار ئەم پرۆسە تازەکارییە دەبێتە هێپۆتێزێکی کارەکییانە بۆ ڕاگەیاندنی پرۆژەیەکی دیکەی تازەکاریی لە نێو زنجیرەی پرۆسەکانی ئەزموونسازی شیعری کوردیی هاوچەرخدا و هاوکات بە هەموو پێکهاتەکەی خۆیەوە دەخرێتە بەردەم کۆی جیهانی وەرگرانی ئێستای ئەدەبی کوردییەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی بکریت ببێتە

هەنگاوێكی كاریگەر بۆ تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە شیعرییەی ئێستا و گەیشتن بە سەرەتای قۆناغێكی تازەی شیعری كوردیی.

ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیر لەم كۆمەڵە شیعرییەی بە نێوی (ناوی تۆ ئیمزای منە) بە پرۆژەیەكی ڕەهەند تەواوی شیعرییەوە دێت و ڕچەی فۆرمسازییە شیعرییە سێنتیمێنتالییە جیاجیاكان، كە زیاتر لە چارەكە سەدەیەك بەرەوژووری خایاند، دەشكێنێ و كارەكیانە ئاماژە بە كۆتاییهاتنی تەمەنی ئەزموونی ستایلە داخراوەكانی دەدات، بەوەی ئەم ستایلانە و پاشماوە و پاشەبەندەكانی لە پرۆسەی نێردەسازیی ئەمڕۆی شیعری كوردیدا كاریگەرییان لەدەست داوە و لاواز بوونەتەوە لەوەی جۆرە هارمۆنیایەك لە نێوان خۆیان و ئیمرۆی جوانخوازانی شیعریی كوردی هاوچەرخ بسازێنن. تەڵعەتی شاعیر لەم دۆخە شیعرییە هاوچەرخە هەستیارەوە دێت و ڕوو لە دروستكردنی تێكستێكی جیاواز و ترازاو لە سیستەمە شیعرییە باوەكە و شوێنكەوتووانییەوە دەكات، ڕوو لە داهێنانی شێوە تێكستێك دەكات، كرۆكی بابەتەكەی لە ویست و خەم و خۆشی و خرۆشی و گرو گاڵی ڕۆژانەی وەرگرانەوە ڕسكابێت، تێكستێك وابەستەی ویستی خۆی و وەرگران بێت، تێكستێك بێت سروشتەكەی وەك جیهانێكی كراوە و ڕەهەندزیندوو و دوور لە ئایدیۆلۆژیاكاریی بۆ جوانخوازانی بگەڕێتەوە، هاوكات هەوڵبدات دووربكەوێتەوە لە تلانەوە و زوخاوسازی و خەفەت و خەیاڵی خودە داخراوەكانەوە، لێرەوە لێكەوتە و ماناكان و جێكەوتەی گوتاری شیعریی لە بەرجەستە شیعرییەكانی تەڵعەتدا نەك هەر ڕەهەندێكی

ئیستێتیکی، بەڵکو بەهایەکی مرۆڤدۆستانەش بەخۆوە دەگرن، بەمشێوەیە شاعیر جیهانێکی تازە و جیاواز لە شیعری کوردیدا واڵا دەکاتەوە، کە جوانییەکانی لە لایەن وەرگرانی هەردوو ئاستی دەستەبژێر و نادەستەبژێر مایەی قبوولکردن بێت، نەوەك لە نێوانییانەوە یەکتا و یەکلاگر بێت، جیهانێکی کراوە و فرەوان و درەوشاوە بێت و ئاڵوودەی ئاڵۆزکارییەکانی وێنەسازی و گەمە سەختەکانی زمان نەبێت، بەشێوەك وەرگر لە نێوان خۆی و تێکستدا پێویستی بە نێوەندگرێکی ڕاڤەکار نەکات بۆ ئەوەی وردەکارییەکانی بۆ شی بکاتەوە، جیهانێك بێت مانا و جوانییەکانی سفت و سووك و سادە بێنە وەرگرتن و بە ساناهییەوە بپرژێنە نێو دونیای کراوەی خەون و خەیاڵی وەرگرانەوە، بە شێوەیەك لە هەست و نەستێکی تەنگەوە بەرەو ڕامان و هەست و نەستێکی فرەوانتر و جۆشدارتریان ببات.

کۆی ئەم تەکنیکە شیعرییە تازەیەی تەڵعەت تاهیر جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان تێگەیشتنی وەرگر و جیهانبینی شاعیر دەپارێزێت، لەپاڵ ئەمانەشدا پێکهاتەکانی تێکست و ڕایەڵە ورد و درشتەکانی توانیویانە لە پەتای تۆمارە زەینییەکان و وەسفکردنی حالگریی و بەدنەستییە ئاڵۆز و گرێکوێرە دەروونییەکانیدا خۆیان دوورەپەرێز بگرن، نەبادا ببنە مایەی دروستبوونی ئەو وێنە زەینییە داخراوانەی زۆرێك لە شاعیران بەمەبەست یا بێمەبەست تا ئێستاش نمایشی هەناوی خۆیانی پێ دەکەن و دەست و دامانیان لێیەوە بەرنەداوە، لێرەوە ئەم ستراتیژە و ئەم ترازانە تەکنیکییەی شاعیر بە شێوەیەکی کارەکییانە دەبێتە

زێدی ئەم ناوازەییە تازەیە و ئەو سەرسامییە جوانەی بە جیهانی وەرگرانەوەی دەبەخشێ.

ئەم کۆمەڵە شیعرییە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات، کەوا گوتاری شیعری کاریگەرتر دەبێت لە لای وەرگرانەوە، وەختێك تێکستەکانی لە خولگەی ئەم تەکنیکە تازەیەدا بخولێنەوە، ئەو تەکنیکەی لە ڕێگەی ڕوونی و ڕوانبێژییەکەیەوە ڕاستینەی قووڵی توانستی شیعری بەدەردەخات، بە پێچەوانەوە لێخنکردنی زمان و تەمومژاویکردنەکانی، زۆر جاران دەبێتە گەمەیەک بۆ حەشاردانەوەی تەنکی توانستی شیعریی و بۆ پەردەپۆشکردنی بێتوانایی شیعریی و سادەیی سەروسیماکانی.

ئەزموونی تەڵعەت تاهیر لەمەڕ دیاردەی شیعریی و ئەو سیمایانەی وەك مەرج لە شیعردا بوونیان هەبێت، لە ڕێگەی دەستنیشانکردنی ئەرکی زمانەوە دەست پێ دەکات، بەڵام دەستپێکردنێکی کارەکییانە، ئەو لە ڕێگەی ئەزموونەکەیەوە دەیەوێت ناڕاستەوخۆ پێمان بڵێت "زمان لە تێکستنووسیی شیعریدا، بەر لە هەموو شتێك ئەرکێکی شیعریی و ڕێفێرێنسی هەیە"، ئەرکی سەرەکی زمان نێردەسازیی مانایەکی کۆنکرێت و پوخت و دیاریکراوی بۆ وەرگر هەیە، بەڵام ئەم ئەرکە مەرجدارە بە بوونی پێکهاتەیەکی ئێستێتیکی لە ستروکتووری زمانە شیعرییەکەدا، پێویستە پێکهاتەی دەستەواژە شیعرییەکانی ئەم زمانە بەبێ گرێوگۆڵ بە وەرگرەوە بگات، یان هەر خۆی لە

سادەیی خۆیدا دەکرێت ببێت بە مانایەکی دیاریکراو، ئەم زمانە مانابەخشە دواجار دەبێتە ئەو هێوێنە شیعرییەی، کە بکرێت لە چەش و جوانخوازیی وەرگردا ڕەنگبداتەوە، لە پرۆسەی تازەکاریی شیعریشدا، پڕژانە سەر ئەم جۆرە گۆڕانکارییانە جۆرێکە لە سەروسەودایەکی سەخت و تێپەڕبوونە بەنێو ئەزموونێکی قورسی نادیار و بێئامان، ئەزموونێکە هەموو شتێکی ئەرێنی و نەرێنی لێ چاوەڕوان دەکرێت.

لە گوتاری شیعریی تەڵعەت تاهیردا، چالاکیی زمانی شیعری دەبێتە ئامرازە سەرەکییەکەی بۆ ئەوەی بتوانێت بە نەرمییەوە لە تەوەری مانادا بخولێتەوە، هەر ئەم چالاکییە زمانییەشە لەم پرۆسەیەدا هەلی ئەوە دەبەخشێتە تێکستی شیعری، کەوا لە ڕێگەی مۆتیڤکارییەکانەوە فۆرمێکی تازە وەربگرێت، شاعیر لە ڕێگەی ئەم کۆنکرێتکردن و سێنترالیزەکردنەی ماناوە هەر تەنها تێکست دروست ناکات، بەڵکو بە ئاراستەی بەهەندهەڵگرتنی نێردەسازییەکانی تێکست دەجووڵێتەوە، بەوەی بواری نێوان گوتاری شیعری و وەرگر ئەوەندی بکرێت بچووکتری بکاتەوە یان هەر نەیهێڵێت، مەبەستم ئەو بوارەیە، هەر لە سەرەتای هەشتاکانەوە تاوەکو نیوەی یەکەمی سەرەتای دوو هەزار و یەك تێکستی شیعری و جیهانبینی و ڕەوانبێژیی شیعری کوردی قوربانی نێرجسییەتی خودی شاعیرانی کورد خۆیان بووە، وەرگر هەمیشە لە پلەی دووەمدا هاتووە، تێکستەکان هەمیشە خۆیان لە سەرەوەی وەرگردا نمایش کردووە.

تێکست لە ئەزموونی شیعریی تەڵعەتدا، ئەو کاتە لە زمان پێک دێت، کاتێك پێکهاتەی ڕەوانبێژیی زمانەکە هەر تەنها بۆ خودی شاعیر و دەستەبژێرەکانی زیندوو نەبێت، بەڵکو بۆ ئەوان و کەسانی ئاساییش هەموار و دەستەبەر بێت، زمانێك بێت چڕپەدوو بێت و لە ڕاگوزاریی ڕۆژانە و گرۆگاڵی وەرگراندا واتاکانی خۆی هەڵکڕاندبێت، زمانێك بێت ڕەنگدانەوەی هەست و نەستی کۆی وەرگران بێت، دەربڕینەکانی بەسەر دونیای جوانویستی وەرگرانەوە بنیشێتەوە، تێکست هیچ بوونێکی نییە ئەگەر زمانەکەی بە دوای وەرگرێکدا بگەڕێت، لە دەرەوەی جوگرافیا و زەمەنی وەرگرتنی ئاسایی خۆیەوە بێت، زمانی تێکست هیچ بەهایەکی بۆ نامێنێتەوە وەختێك وێڵی ئەو وەرگرە دەستەبژێرە بێت، کە هەر تەنها لە ئەگەرەکانی بەرهەمهێنەری تێکستی شیعریدا بوونی هەبێت.

جیاوازی ئەزموونی تەڵعەت تاهیر لەگەڵ شاعیرانی بەر لە خۆی کە لە هەشتاکانەوە تا سەرەتاکانی دوو هەزار پرۆسەی تازەگەریی چوارەمی شیعری کوردییان پێکهێنابوو، لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە تێکست لە لای ئەوان لە زمانێکی داخراوەوە گوزارشت لە جیهانێکی داخراو دەکات و لە لای تەڵعەت زمانێکی کراوە گوزارشت لە جیهانێکی کراوە دەکات، بەم شێوەیە گوتارە شیعرییەکەی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت زمانێکی داخراو ناتوانێت گوزارشت لە جیهانێکی کراوە بکات، کەواتە دیسانەوە زمان کۆڵەکەی بنەڕەتی و سەرەکییە لە دیزاینکاریی تێکستدا، بەڵام چەندیی و چۆنیی داڕشتن و

بەکارهێنانەکەی لە ئاخێزگەی خۆیدا زۆر گرنگترە، ئا لێرەدا تەڵعەت دێت بە پێوەر و ئەزموونەکەی خۆیەوە لە سەر ئەم خاڵە هەرە هەستیارەوە دەوەستێت و دەست دەکات بە هەڵوەشاندنەوەی سەرلەبەری پێوەر و ئەو هاوکێشانەی لە پێشوودا پێڕەو دەکران. بە شێوەیەك زمانێکی پڕ ئێستێتیکی فرە ڕوون و بێ گرێوگۆڵ دابڕێژێت، بەرجەستەی بیرۆکەیەك بکات، کە زادەی بابەتێکی ڕۆژانەی ئەم ژیانە بێت یان لە ڕۆحی گوزەرە سادەکەیەوە دەریهێنابێت، دواجار بتوانێت بیرۆکەیەکی شیعری دروست بکات و گوزارشت لە لێکەوتەیەکی ساز یان ناسازی ئەم گەردوونە بکات.

کەواتە کۆی پڕۆژەکەی تەڵعەت تاهیر بە ئاراستەی دەربازبوونی تەواوی بووە لەو پێکهاتە شیعرییەی بە شێوەیەکی دیاریکراو لە زەینسازییەکانی بزووتنەوەی تازەگەریی چوارەمەوە سەری هەڵدابوو و زیاتر لە چارەکە سەدەیەك وێناکاریی شیعریی کوردی لە نمایشکارییەکەی خۆیدا مۆنۆپۆل کردبوو، بەڵام دواتر و بە دیاریکراوی لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ئەم سەدەی بیستویەکە و لە پاڵ هەموو ئەو وەرچەرخانە سیاسی و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و مێژوویی و پێشهاتە ئێستێتیکیانەی ئەدەبی کوردی بە خۆیەوە بینیبوو، دەبوایە بزووتنەوەیەکی دیکە بێتە ئاراوە، بزووتنەوەیەك فۆڕمێکی تازەتر بێنێتە بەر گیانی شیعری هاوچەرخی کوردییەوە، فۆڕمێك کراوە بێت، بە تایبەت دوای ئەوەی نموونە شیعرییەکانی تازەگەری چوارەم کەوتبوونە زێدەڕۆییێکی نالۆژیك لە داخران و چڕبوونەوە هەڵکورمان

بەسەر خۆی و دووبارەبوونەوەی فۆرمسازییەکەیانی لە خولانەوە و گیرخواردنییـان لە نێـو نمایشـە زەینییەکـانی ئەزمـوونەکەی خۆیاندا، بە شێوەیەك بوار و لاسەنگییان نێوان وەرگر و تێکست گەیاندە کۆتاییەکەی، تەڵعەت لە وردبـوونەوە لەم ڕەوشـە دوور نەبـوو بەڵکـو ڕۆژانە لەگەڵیـدا ژیـاوە تـا دواجـار توانیـویەتی بە پرۆژەیەکی تایبەت بە خۆیەوە بێتە پێشەوە.

سیمای سەرەکیی ئەزموونی شاعیر لە لادان و دوورکەوتنەوە شیعرییەکەی لە دیاردە باوەکان بە ئاشکرا دەبیندرێت، لادان لەو دەستەواژە و پێکهاتە زەینییانەی نـاتوانن هێـزی شـیعریی خۆیـان چالاکتر بکەنەوە بۆ ئەوەی بیگەیەننە وەرگـرانەوە، بە ئاشـکرا لە بەشـێکی سـەرەکی ئەزمـوونەکەی ڕەنـگ دەداتەوە، دوورکەتنەوەیشـی لە کـاریگەریی ناوەگەورەکـانی شـیعری هـاوچەرخی کـوردی کە پانتـاییەکی گەورەیـان لە ئەزمـوونی شیعری کوردیدا داگیر کردبوو خـۆی بە زەقـی دەبینێتەوە، ئەو ناوانەی تا ئێستاش ڕێژەیەکی کەم تا زۆر وەك نمـوونەی بـاڵای شـیعریی ناویـان دێـت، بەڵام لە بنەڕەتـدا تێکسـتەکانیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پرۆسەی جوانوەرگریـدا لاوازتـر دەبـنەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ وریایی و وشیاری وەرگر و گەشـەکردنی چەش و ئارەزووەکـانی، ئەو وەرگـرەی تەنـانەت بە هەسـت و نەسـتی خۆڕسکی خۆیەوە وردە وردە جوانییە شـیعرییە نادروسـتەکان لە جـوانییە شـیعرییە دروسـتەکان جیادەکـاتەوە. بەڵام دۆزیـنەوەی دیزاینە نوێیەکان و جیاکردنەوەیان لەگەڵ ئەو بەرهەمـانەی تـژی بـوون لەو ڕسـتە و دەسـتەواژە شـیعریيانەی لە نێـو گۆڵمێـك لە

دەربڕینی زەینیی ئاڵۆز خنکێندرابوون، کارێکی هەروا سادە و سانا نەبوو، بە ڕاددەیەك زۆر جار دەرچوون و دەربازبوون لێیانەوە هیچ ئومێدێکی لێ نەدەبیندرا، ڕزگارکردنی شیعری کوردی لەم ئاڵوودەبوونەی بەم ئاڵۆزییە پرۆسەیەکی سادە و ساکار نەبووە، بەڵکو پێویستی بە زنجیرە هەوڵێکی لە ڕاددەبەدەر بووە، ئەم هەوڵانەش هەر تەنها خۆیان لە دووبارە خوێندنەوەی شیعری کوردیدا نەدەدۆزییەوە، بەڵکو دووبارە پێداچوونەوە بە قەوارەی کاریگەریی ئەزموونەکانی بەر لە خۆی بەسەر نەوەکاندا و سەرنجدانی ئەزموونەکانی چواردەورەی خۆی و کاریگەریی ئەم ئەزموونانە بەسەر خوێنەرەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی وەرگر لای شاعیر پێویستە لە شێوە پەراوزییەکەی دەربازی بێت و ڕۆڵێکی تەوەرییانە وەربگرێت یان دروستتر بڵێین وەرگر دوای ئەوەی کاتێکی دوورودرێژ لە فەرامۆشکردنی ڕۆڵە سەرەکییەکەی لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی شیعریدا تێدەپەڕێت، ئەوسا بە دیار دەکەوێت کەوا پێویستە بە شێوەیەکی شیاوتر ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت و ڕۆڵێکی سێنتراڵ و کاریگەر وەربگرێت.

لەم ئەزموونەی تەڵعەت تاهیر کە لە تێکستە تازەکانی ئەم کۆمەڵە شیعرییەدا دەیبینین، توانیویەتی جیاوازیی و جوانییەکانی تێکستەکان بگەیەنێتە ئەو ئاستەی ببێتە پڕۆژەیەکی سەربەخۆی تازەکاریی شیعریی، لێرەوە ئەو ڕاستینەیەمان بە ڕوونی بۆ بە دیار دەکەوێت، کەوا ئەم فۆرمە شیعرییەی شاعیر و کۆی پڕۆژەی

گۆڕانکاری و دیزاینکارییە شیعرییەکانی بێ جیهانبینی و بێ پلان و دوور لە نەخشەدانانێکی تۆکمە و توندەوە نەهاتۆتە بەرهەم، ئەم فۆرمە لە دەرەوەی بیرکردنەوەی قووڵ لە خودی ئەزموونی شیعریی قۆناغەکە و ڕابردوو و ئایندە و چارەنووسی شیعری کوردی بەگشتی نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵکو جۆرایەتی گوتارە شیعرییەکەی زادەی خوێندنەوەی قووڵ و دەرهاوێشتەی چاوەدێریکردنی گەشەکردنەکانی ئەزموونە سێنتیمێنتالییەکەی شیعریی کوردیی هاوچەرخ بووە و دەرچوونی لە لۆژیکی ئەو زمانە شیعرییە بووە، کە لە دەرەوەی بەهای وەرگرەوە ڕەفتاری لەگەڵ تێکستدا کردووە، لادانێکی ڕادیکاڵانە لە بەرهەمی چارەکە سەدەیەك لە کۆششێکی بێوچانی شیعرسازی و ئەزموونی وردی تێکستکاری بووە، بەری ڕامانێکی قووڵ و خۆڕاهێنان و ستراتیژ و سیاسەتێکی جیای لەگەڵ هەموو هاودەمانی خۆیدا هەبووە. بەم شێوەیە لە ڕێگەی ئەم کۆمەڵە شیعرەی بە نێوی (ناوی تۆ ئیمزای منە)، بە ڕوونی دەگەینە ئەو ڕاستینەیەی ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیر لە قووڵایی ڕامانێکی هێمنانە و جیهانبینییەکی شیعریی فراوانەوە سەرچاوی گرتووە، ئەم ئەزموونەی لە ئەنجامی وریایی و خوێندنەوەیەکی وردبینانە و تێگەیشتنێکی تایبەت و نەخشەسازییەکی توندوتۆڵ و پلانێکی تۆکمەوە هاتۆتە کایەوە، ئەو بناغەسازیی پڕۆژە شیعرییەکەی بە ئاراستەی دۆزینەوەی ڕاستگۆییەکانی تێکست و گەمە جوانەکانی زاروزمان لە پێناو دەستەمۆکردنی سایکۆلۆژی

جوانـوەرگریی دەخـاتە کـارەوە، ئەمەش یەکـێکە لە خـاڵە هەرە هەستیارەکانی ئەزموونە شیعرییەکەی، کە وادەکات خێراتر بگاتە هەست و نەستی وەرگران و بکارێت هێورهێور بەسـەر زەیـن و زاتییانەوە بنیشێتەوە.

شیاوی ئاماژەیە بڵێین وەرگـر بە خـۆی و خەون و خەیـاڵ و خووەکـانییەوە لە هێپـۆتێزی شـیعریی تەڵـعەت تـاهیردا نەك هەر ڕۆڵێکی سێنتراڵ وەردەگرێت و پێگە و شکۆ و شایستەیی خۆی بۆ دەگەڕێتەوە، بەڵکو سەنگ و ڕەنگ و ڕۆڵی هەڵدەکشێت بۆ ئەوەی لە سازاندنی تێکستدا پشـکدار بێـت، تایتڵەکـانی وەك (بە ڕووی ئەم جیهانە ناشرینە جوانیت بەرز دەکەمەوە) و (ناوی تـۆ ئیمـزای مـنە) لە خۆیانـدا وەك گەواهییەکـی ناڕاسـتەوخۆی ئەم هاوهەستییەی خرۆشانی خـۆی و وەرگـرن، کە لە تێکسـتەکانیدا خـۆی وەك شـاعیر و ئەوی وەرگـر وەك جـوانگری شـیعریی لەگەڵ یەکـدا سـێنتراڵ دەبـن، نەوەك هەر تەنهـا خـودی شـاعیر سێنتراڵی هەر هەموو شتێك بێت، بەڵکـو وەرگـریش ئەو مـافەی پێ دەبەخشرێت لەگەڵ تێکسـتکاردا کـارا بێـت، لە ڕیالیتەکـانی جوانوەرگرییدا هەماهەنگ و هەموارسازیی تێکست بێـت، کـارا بێت لە جێکردنەوەی شوێنێکی شیاو بـۆ خواسـت و ویسـتەکانی وەرگر لە نێو تێکست و جیهانی تێکست و ماناکانییەوە، وەرگـر جۆشوخرۆشی و خوردەی پێکەنـین و گروگـاڵی ناخۆشـییەکانی ڕۆژانەی خۆی بە شاعیر دەبەخشێت، بارگە و بابەت و خەنین و خەفەتی خۆی دەخاتە بەردەستییەوە، شاعیریش لە خودی خۆیدا

ئەم دراوە لەو دەستەواژە و ئەو پەیڤانە گەڵاڵە دەکات و ویتایان دەکات، کە لە پێکهاتەیەکی ئێستێتیکییەوە بۆ خودی وەرگر بگەڕێنێتەوە.

بەرهەمی شیعریی لە ئەزموونی تەڵعەت تاهیردا، هەوڵ دەدات بچێتە دەرەوەی هەموو ئەو پەراوێزخستنانەی لەمەڕ وەرگرەوە کراوە، ئەو پەراوێزخستنانەی دەمێکی درێژ شیعرسازانی دونیای ئەدەبی کوردی پێڕەویان کردووە، بە پێچەوانەوە دەکرێت لە ڕوونیی گوزارشتکردنەوە و بەکریستاڵکردنی تێکست باشتر بدرەوشێتەوە، لە هەماهەنگبوونی لەگەڵ جیهانی مرۆڤە پەراوێزخراوەکانی گوزەرگەی جوانتر بسازێت، ئا لێرەوەیە هەردوو جەمسەری شیعرسازیی کە لە دەنگی شیعریی تەڵعەتی شاعیر و وەرگرانییەوە پیک هاتووە، بە شێوەیەکی بەردەوام یەکتر دەخەنە چاوەڕێی مانا و ڕووداو و کار و گوتاری جیاوازترەوە.

تەڵعەت تاهیر بوێرانە و وردە وردە توانی لە باوەڕە شیعرییە باوەکان کە کۆنترۆڵی تێگەیشتنی شیعریان کردبوو دەربچێت و دواجار بگاتە ئەو باوەڕەی، تێکستی شیعری کوردی نابێت ئاڵوودەی ئەم هەموو سەهەندی و بێمانایی و وڕێنەکارییە شێوە سۆزمێنتالییە بێت، کە تێکستی شیعری زۆرینەی جار ئەگەر لەبار نەبات، ئەوا لاوازی دەکاتەوە، ناکرێت شاعیر هەر تەنها گوزارشت لە وەردەکارییەکانی خودی خۆیەوە بکات، تێکست ناساز دەبێت وەختێک تا ئەو ڕاددە زۆرە وابەستەی

زەینکارییەکانی دۆخی داخراوی خودی شاعیر بێت، نابێت تێکست جوانییەکانی خۆی هەر تەنها لە لاری و لاتەریبی و ناهاوسەنگیی خۆی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا بدۆزێتەوە، ناکرێت زمان ئەو زمانە بێت کە وەرگری ئاسایی لێیەوە تێنەگات، تەنانەت هەندێ جار بگاتە ئەو ڕاددەیەی شاعیر بە مەبەست یان بێمەبەست وا بکات وەرگری شیعریی لە ئاست وێنە و دەستەواژەکانی تێکستەکەوە خۆی بە گەمژە و بێئاگا و بێتوانا ببینێتەوە، ناشێت مانا تا ئەو ڕاددە فرەوانە زادەی حاڵەتە بینراو و هەستپێکراوەکانی ڕۆژانەی ئەم گوزەرانە نەبێت، گۆڕانکاری و هەڵگەڕانەوە لەم چەمکانەدا هەر هەمووی لە تێکڕای تێکستەکانی ئەزموونی تازەکاریی شیعریی تەڵعەت تاهیردا زۆر بە ڕوونی و سەرکەوتووانە ڕەنگ دەدەنەوە.

ئەگەر لە پێشوودا چالاکییەکانی ڕەخنەی شیعریی کوردی سەرقاڵی کردنەوەی کۆد و دەستەواژە و پێکهاتە ئاڵۆزەکانی تێکستی شیعری بوو بن و هاوکات مانا حەشاردراوە ئەگەرییەکان بۆ خوێنەر بدۆزنەوە و ئاشکرایان بکەن و ڕاڤە و ڕوونیان بکەنەوە، دواجار ئەرکی ئەوەیان لە ئەستۆدا بێت، ئەو نهێنیی ئەو جوانییە شیعرییەی ئاخێنراوەتە نێو تاریککاری و لێڵییەکانی زمانی تێکستەوە بۆ خوێنەری ڕوون بکەنەوە، ئەوا لەم قۆناغەدا ئەرکی ڕەخنە پێچەوانە دەبێتەوە، ڕەخنە ئەوەی لە پێشە نهێنی و پەنهانی ئەو جوانییە شیعرییە ڕوون و ڕەوانەی لە پشت ڕەوانبێژی و ڕوونکارییەکانی زمانی تێکستە بۆ وەرگرانی ڕاڤە بکاتەوە، ڕەخنە ئەوەی لە پێشە بتوانێت ئاماژە بە جوانییەکانی

دەربڕین لەو خەسڵەت و خەم و خووانەی وەرگر بکات، کە لە تێکستەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، هاوکات دوور لە دۆزینەوەی جوانییەکانی جیهانی وەرگران، ئەوا بە ئاسانی ناگەینە کرۆکی نهێنییەکانی تێکست و ستراتیژەکانی و کۆی گوتاری شیعریی، ئا بەم شێوەیە چالاکییە دروستەکانی ڕەخنە سیمایەکی ئۆرگانی وەردەگرن، هەر لێرەوەش ئەم چالاکییانە دەتوانن ئێستێتیکا و نهێنیی ڕەوانسازیی لە ئەزموونی شیعریی تەڵعەتدا بدۆزنەوە و دواجار چۆنییەتییەکانی لادان لە تێکستە شێوە نەریتساکان بدۆزنەوە.

لە ڕۆشنایی ئەم سەرنجانەمان دەگەینە ئەو ڕاستینەیەی ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیر و پرۆژەی تازەکارییەکەی لەسەر ئێتیکی هاوسەنگی دەنگی شیعریی خۆی و وەرگری زیندوو بینا کردووە، پرۆسەی بەرهەمهێنانی تێکستی ئەو وابەستەی پێوەندییە ڕاستەوخۆکانییەتی بە جیهانی وەرگرانییەوە، لەبەر ئەوەی وەرگرانیش بە بەردەوام لە دۆخی گۆڕاندان، ئەوا هاوشانی ئەم گۆڕانە، زمان و بابەت و مۆتیڤەکانی خۆی لە ئەزموونە شیعرییەکەیدا بە بەردەوام دەگۆڕێت و نوێی دەکاتەوە هاوکات پەرە بە تەکنیکەکەیەوە دەدات و تازەی دەکاتەوە، هەموو ئەمانەش دواتر دەبنە ڕێسایەکی تۆکمە و زیندوو بۆ قبوولکردنی ئەو ڕاستینەیەی وا دەکات تێکستسازیی سەرکەوتوو، وابەستەیی سێیانەی وەرگر و داهێنانی شاعیر و تازەکارییەکانەوە بێت.

ئەم پرۆسە شیعرییەی شاعیر لە قۆناغێکی شیعری کوردی وەها هەستیاردا هاتە ئاراوە و پێکهاتەکانی خۆی وەرگرت،

زۆرینەی ئەزموونە شیعرییەکان گیرۆدەی مەقام و میراتێکی تەکنیکی وەها ببوون، کەوا وەرگری شیعری بە گشتی وردە وردە دڕکی بە دووبارەبوونەوەی خوێندنەوەکانی خۆی دەکرد، بە شێوەیەك هەستی بەوە دەکرد زۆرینەی تێکستە شیعرییەکان لەیەکدەچن و تەنانەت هەندێ جار تەکنیکسازییەکان یەکتر کۆپی دەکەنەوە یان لە شوێن خۆیانەوە یەکتر دەخوێننەوە و خۆیان دووبارە دەکەنەوە، لە سەروبەندی ئەم ڕەوشەدا چەشی شیعری کوردی پێویستی بە هاتنە ئاراوەی تێکستێکی تازە بوو، تێکستێك بتوانێت متمانەی وەرگر بۆ شیعری کوردی و هێزەشاراوەکانی بگەڕێنێتەوە، دووبارە ڕوو لە تێکستی شیعریی کوردی هاچەرخ بکاتەوە، یان لە کەمی وا بکات ئیدی لە جیهانەکەی دوور نەکەوێتەوە، ڕێگەچارەیەك هەبێت کەوا لە ڕێگەی سیستێمێکی تازە و جیهانبینییەکی شیعریی جیاوازەوە چەش و جوانییەکی جیاواز و ڕەوانییەکی تایبەتیی هەبێت، لە خەونە گەردوونییەکان بکشێتەوە و لە حاڵەت و وردە ڕووداوەکانی ڕۆژانە ورد بێتەوە و لە مۆتیڤی شیعریدا گەردانیان بکات و دواجار ئەزموونێك بێنێتە ئاراوە، تیایدا شیعری کوردی هاوچەرخ لەو زەین و زمانکارییە تەمومژاوییە تەڵخەی خویدا دەربهێنێت و ڕزگاری بکات، ئەزموونێك بێت بە ڕۆحێکی زیندووەوە بێت و ڕەنگدانەوەی خەون خەیاڵ بێت و زایەڵەی هەست و نەستی ڕاسگۆیانەی ڕۆژانەی مرۆڤی سەر ڕووی ئەم زەمینە بێت، ئەزموونێك بێت تەنانەت شاعیری هاوچەرخ لە واهیمەی شیعرسازییەوە دەربازی بکات بۆ ئەو تێکستسازییەی، لە

ڕاســـتینەی توانســـتی شـــیعرییەوە هەڵـــدەقوڵێن. ئەم دیـــمەنەی تێکستەکانی تەڵعەت تاهیر پێمانی دەبەخشێت نزیکمان دەکاتەوە لەوەی ئەم تەکنیکە شیعرییەی شاعیر دەکرێت بکرێتە تیۆرێکی سـەرەتایی یـان ببێـت بە چەمکێکـی گونجـاو بـۆ دامەزرانـدنی ئاراسـتەیەکی تـایبەتیی شـیعریی کـوردی هـاوچەرخ، لە هەمـان کاتدا دەکرێت ڕێساکانی لە لایەن شـاعیرانی دیـکەوە پراکتیـزە بکرێـت شـەپۆل و تەوژمـی جیاجیـای لێـوە هەڵبێـت دواجـار دیاردەیەکی شیعریی فرەوانی لێوە پێک بهێنـدرێت، ئەزموونێـك بێت، مانا نەکـاتە قوربـانی گەمەکـانی زمـان، مۆڕاڵی داخـراوی نەکـاتە سـەکۆی نمـایش و شـاردنەوەی بـوودەڵەیی شـیعریی، ئەزموونێك بەهای وەرگر بۆ کۆی پرۆسەی شیعریی بگەڕێنێتەوە و وەک پنتێکی سەرەکی لە پایە و پێگەی خۆیەوە بیانژمێرێـت، ئەزموونێـك خولیـا و زێـدی گـوزەرگە و ڕاسـتییەکانی بێـت و هەمـاهەنگی خرۆشـییەکانی خەون و خەیـاڵ بێـت ئەو خەون و خەیاڵەی ببێتە ئێکسیری شیعرنووسیی، تـا لە کۆتاییـدا تێکستی بەرهەمهاتوو ئایندە و پێگە و جێگەی خۆیان نەك هەر لە جیهانی شیعری کوردیـدا هەبێـت، بەڵکـو لە نێـو ئەزمـوونە شـعرییەکانی زمانانی دیکەی ئەم جیهانەشدا، کە ئێمەش بەشێکین لێـیەوە کەم تا زۆر ڕەنگ بداتەوە.

تێپەڕانـدنی ئەزمـوونی شـیعر بـۆ خۆنووسـین و تێکستسـازیی دەربـازبوون لە گوتـارە شـیعرییە داخـراوەکەی و بەجێهێشـتنی تەکنیکسازیی و جیهانبینییە لێلەکەی بۆ تەڵعەتی شاعیر ئەرکێکی سانا نەبوو، ئەرکێك بوو دەبوایە بەر لە هەموو شتێك بێـت و لە

گۆشەنیگایەکی ئیتیکییەوە کاری لەسەر بکات بۆ ئەوەی پایە و پێگە بۆ وەرگر دەستەبەر بکات، هاوکات بکارێت بەها ئیستێتیکییەکە بۆ خودی تێکستی شیعری بگەڕێنێتەوە، بەوەی ناکرێت تێکست ئەوەندە زەیناوی و سێنتیمێنتال بکرێت، تەنانەت ئەگەر هۆی سیاسیشی لە پشتەوە بوو بێت، دیسانەوە ناکرێت شاعیر تێکست بەم هەموو زێدەڕۆییەی بەدحاڵەتی و هەڵوەسە و تلانەوەی خودی خۆیەوە تەڵخی بکات و پێی وابێت ئەم دەربڕینانە جیهانبینییەکی گەردوونییە و هەمووکەس ناتوانێت شرۆڤەی بکات یان ناکرێت لێیەوە تێبگات، بۆ ئەوەی ئەم تێگەیشتنەش مەقامگیر بکرێت، ئەوا دەبوایە تێکست هەر بە لێڵییەکەی خۆیەوە لە دایك ببێت یان تەڵخ و لێڵ بکرێت.

جێی ئاماژەیە کەوا تەڵعەت تاهیر لە کۆی سیستەمە شیعرییەکەی قۆناغەکە ژیاوە و تەنانەت خۆیشی لە سەرەتاکانی ئەزموونە شیعرییەکەیدا بە شێوەیەکی ڕێژەیی هاووشۆی پێشکەوتنەکانی ئەم پرۆسە هەشتاییەی کردووە، بە واتایەکی دیکە ئەو لە قووڵایی ئەو ئەزموونە سێنتیمێنتالییەدا سەرنجی وردی لە تێکست داوە و درکی بەو کەلێنانەدا کردووە، کە بوونەتە خاڵی لاواز و لاوازکاری شیعری کوردی هاوچەرخ، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کەوا ئەزموونی شیعری ساڵانی هەشتا لە بنەڕەتدا پێویستییەکی مێژوویی بووە لە شیعری کوردیدا و تەنانەت وەرچەرخانێکی گرنگ بووە بۆ تازەکردنەوەی زمانی شیعریی تا ئەو ڕادەیەی شیاوە پڕۆژەیەکی تازەکاریی سەربەخۆ پێک بهێنێت و پێشتر ئێمە بە تازەکاریی

چوارەم ناومـان هێنـاوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەوا کـۆی ئەزمـوونەکە لە داخـراوی پرۆسـەکەی خۆیـدا توانیـویەتی بێـتە دەرەوە. لێرەوە ئەم پرۆسە شیعرییەی تەڵعەت تاهیر ئەو ئەزموونە شیعرییە نییە هەوڵی دابێت بە چەند بەردەبازێکدا لە رووبـارێکی لێڵاویدا خۆی بپەڕێنێتەوە، یان دروسـتتر بڵێـین تێکستەکانی ئەم گەشەسەندنە شیعرییەی شاعیر هەروا سانا و رەمەکییانە نەبووە لە جیهانبینییەکی شیعرییەوە بەرەو جیهانبینییەکی شیعری دیکە ڕێگە ببڕێت، بەڵکو هەنگاوێکی فرە بوێرانە بووە، بەشـێوەیەك مکـووڕ بووە لەسەر ئەوەی ڕێکار و ڕێسا شیعرییەکانی کارەکییانە بەجێ بگەیەنێت.

کەواتە تازەکاریی و گرنگیی ئەم کۆمەڵە شیعرییەی تەڵـعەت تاهیر لە ڕووی تەکنیکییەوەی دەگەڕێتەوە بۆ کارکردنە جیددییە ڕاستەوخۆکەی بۆ ئەوەی هەودای وەرگر لەگەڵ مۆدێلە شیعرییە باوەکانـدا بپسـێنێت، ئەمەش لە ڕێـگەی تـازەکردنەوەی زمـانی شـــیعری و ڕنیـــنەوەی بـــابەتی ڕۆژانە و ئایرۆنســـازییەکانی و بەکارهێنانی ڕێسا هاوتاکـان لە تەکنـیکە شـیعرییەکەیەوە، کـۆی ئەمانەش وەك ئەلتەرناتیڤێکی دیکەی شیعریی لە جیهانی ئەدەبی کوردیـدا دەیانخـاتە ڕوو، بە ئاراسـتەی بکێشـکردنی وەرگـر بـۆ ئەوەی ئارەزووی لە مۆدێلەکەی پێشووەوە بە ئاراسـتەی داهێنـان و سیحری شیعری خۆیەوە برسکێنێت، هاوکات سەرنجڕاکێشانی ڕەخنەکارانیشە، بەوەی ئەم مۆدێلەی پێشوو دەمێکی دوورودرێـژ پـایە و پـێگەی وەرگریـان لە فەرامۆشـییەکی گەورەدا جـێ هێشـتووە. بەم شـێوەیە تەڵـعەت تـاهیر لەم گۆڕینکـاری و

تازەکارییەی لەم کۆمەڵە شیعرییەدا هێناوییەتییە ئاراوە، سەرنجمان بۆ ئاوێزانی بابەتێکی ئەدەبی و بابەتێکی ڕەخنەیی هەستیاردا ڕادەکێشێت ئەویش سەنگ سایەی وەرگرە بەسەر تەکنیکی تێکست و پرۆسەی نێردەسازی لە گوتاری شیعری کوردیدا، لە لایەکی دیکەوە بەهای ئەم کۆمەڵە شیعرییە لەم هەلومەرجەکەی خۆیدا ئاماژە بەو ئەگەرە دەدات کە تێکستی شیعری کوردی ئیدی دەکرێت بە تەکنیکی ئەم نموونانەی لەم کۆمەڵە شیعرییەدا نمایش دەکرێت، بنووسرێتەوە، دواجار خۆی بگەیەنێتە پایەیەك بکرێت لە ئاستێکی جیهانییەوە بخوێندرێتەوە، دەنا ئەو تێکستانەی هێشتا لە نێو خولگەکانی پێش خۆیدا و لە دەور خۆیدا دەخولێنەوە ئەم ئەگەرەی بە جیهانیبوونی تیادا کەمترە.

زیندوویی ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیر و کاریگەریی و کۆی ئەندازەکارییەکانی و فرەوانی ڕێژەی وەرگرانی هەر دوو جۆری دەستەبژێر و نادەستەبژێرانی، هەر تەنها زادەی ترازان لە نەریتەکانی تێکستکاری و دەرچوون لە ڕێساکانی گوتاری ئەمڕۆی شیعری کوردی نییە، بەڵکو مکوڕبوونییەتی لە سەر واڵاکردنەوەی ئەو کەناڵانەی بایەخ و بەهایەکی گەورەتر بە خەم و خۆشی و خرۆشییەکانی مرۆڤی دەوروبەر دەدەن، ڕژدبوونییەتی لەسەر چێکردنی هارمۆنییایەکی گونجاو نێوان گۆشەنیگای شیعریی خۆی و جوانخوازیی وەرگران بە هەموو هەست و نەستەکانییانەوە، لە پێناو ئەنجامدانی ئەم ستراتیژییەش، ئەوا تێکست پێویستی بەوە بووە، سروشتی خۆی وەك جیهانێکی کراوە نمایش بکات، بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش، دەبوایە

توخمەکانی خۆی وەك پێکهاتەیەکی ئۆرگانی بە ڕووی گشتیی وەرگراندا والآ بکاتەوە، نەوەك بۆ بەشێکی سنووردار لە وەرگرانەوە، بۆ ڕەختاندنی ئەم پێکهاتە ئۆرگانییەش، شاعیر ڕوو لە ڕوونی و ڕەوانبێژی زمان دەکات تاوەکو لە ڕێگەیەوە بتوانێت ساناتر و جوانتر ڕامی مانا هاوبەشەکانی نێوان خۆی و ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی دەورووبەری بکات.

لە دەرەوەی نوێکردنەوەی دید و بۆچوون و جۆری خوێندنەوە ڕەخنەییەکانمان، ئەوا کۆی پرۆسەی ڕاڤەکاریی بۆ ئەزموونی شیعریی تەڵعەت تاهیر و ئاوڕدانەوە و شیکارییەکانی ئەو توخمانەی فۆرمی تێکستەکانی ئەو پێک دەهێنن، دەکەونە ئەستەم و ئەستەنگییەوە، دواجار لە پرۆسەی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لەمەر داهێنان و تازەکارییە شیعرییەکەیدا دێنە کایەوە کەمباریی و کەموکووڕیی دێنن، بە تایبەت لە بواری تێگەیشتن لە کرۆك و کاریگەریی ئەو ڕوونکارییە زمانییەی گوزارشتی تێکستەکانی ئەو پێک دێنن، هەر بۆیە لواندنی پێوەر و ڕەخساندنی میتۆد و ئامرازی تازەتر لە خوێندنەوە ڕەخنەییەکاندا ئەگەری دۆزینەوەی نهێنییەکانی تەکنیکی گوتارە شیعرییەکەی شاعیر زیاتر دەکاتەوە و هەلی نزیکبوونەوە لە فەزا و هێڵ و ڕایەڵەکانی ئەندازە و ئەندازەکاریی تێکستەکانی گەورەتر دەکاتەوە، لێرەدا مەبەستمان ئەو نزیکبوونەوانەیە، کە بکارن بەر و بەها جوانەکان لە قووڵایی هەماهەنگییەکانی ئەم داهێنانەی شاعیر بدۆزنەوە، دۆزینەوەیەك تەکنیکسازی و پاشخانە مێژوویی و ئەبیستیمییەکانی ئەزموونی تازەکارییە شیعرییەکەی

شاعیر ئاشکرا بکەن و بتوانن تاڵ بە تاڵ تانوپۆ درەوشاوەکانی شیتەڵ بکەن و دواجار نهێنییە ورد و درشتەکانی ئەم فۆڕمسازییە ڕوون بکەنەوە، کە دیزاینی جیهانی هەر تێکستێك لە تێکستەکاتی شاعیری پێک هێناوە.

ئەم هەوڵە فراوانەی تەڵعەت تاهیر لە پێناو گەیشتن بە چێکردنی تێکستێکی کریستاڵیی ساف و بلووریی هەڵدەکشێت، تێکستێك مانایەکی کۆنکرێتی ڕوون و ڕەوان و زەلال بە وەرگرەوە ببەخشێت، هاوکات بیرۆکەیەکی دیاریکراوی تێدا هەبێت، تێکستێك بێت دوور بکەوێتەوە لە گرێوگۆڵ و ورێنەسازیی و دابڕێت لەو تەمومژییەی دەمێکی دووردرێژە سیمایەکی نەرێتی و نالەبار بە ڕۆحی شیعریی کوردییەوە دەبەخشێت، بێگومان ئەم تەمومژییە وەك ئامرازێك هەمیشە لەباربووە بۆ ئەوەی زۆرانێك وەك چەپەرێك بەکاری بهێنن بۆ حەشاردانەوەی بێتوانایییە شیعرییەکەیان لە میانی داهێنان و تازەکردنەوەکانی فۆڕمی شیعرییدا، ئەم ئاکارە ناسازەش میراتێکی لاواز و شێواوی لە تێکست و تێکستسازیی کوردی بەدوای خۆیدا جێ هێشت، تەنانەت کاریگەریی و شوێن پێی و پاژنەکانی بەسەر ئێستای شیعری کوردیدا هێشتا بەردەوامە و هەمیشە وەك پنت و پۆرگی سێنتیمێنتالی دێنە بەر پرۆسەی وەرگرتن، سێنتیمێنتکردنی تێکستی شیعریی بە تایبەت ئەو کاتەی چمکێك سینبۆڵ و کۆدی دەئاخنرێتە نێویەوە، لە تەڵخی و لێڵکردنی بیرۆکەی شیعریی و تێکدانی هاماجەکەی هیچی دیکەی لێ ناکەوێتەوە، ئەم شەنوکەوسازییە نابێتە هێوێن و

هەناسەی تێکستێکی زیندوو و سەرکەوتوو، بەڵکو لە هەوڵێك بۆ ڕووپۆشکردنی بێباری شیعریی چیتری لێ ناکەوێتەوە، دواجار لە تێکستێکی لاواز بەولاوە هیچی دیکەی لێ بەرهەم نایەت.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی، دەرچوونی تەڵعەت لە نەریت و ڕێسا باوەکانی ئەم قۆناغە و داهێنانی دیزاینێکی تازە، ئەرکێکی وەرچەرخانە بووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی وەك دیارە، تێکستی شیعری کوردی بە تایبەت لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە بەدواوە دیل وکۆتوبەندکراوی ئەو فۆرمە سێنتیمێنتالییە بوو کە ئاماژمان بۆ کرد و نەیدەتوانی لە ستروکتوورەکەی خۆیەوە کە تیایدا تا دەمانێکی دوورودرێژ قەتیس مابووەوە بە ساناهی بێتە دەرەوە، یان هاتنەدەرەوەی پێویستی بە پرۆژەیەکی شیعریی تۆکمە دەکرد کە لە ئارادا نەبوو، یان ترسێکی گەورە هەبوو لەوەی شاعیران بێنە دەرەوەی تانوپۆی پرۆسە شیعرییەکەیان و دواجار لە نێوان گەمەی شیعرییدا بزر ببن و ئەزموونەکەیان پێ کۆنەکرێتەوە و کارەکانییان بە هەڵوەشاوەییەوە ببینن، ئەم جۆرە ئەزموونە نارِوونەی ئەو قۆناغە وای کردبوو پێکهاتە و ئەندازەی تێکستەکان خۆیان دووبارە و سێبارە بکەنەوە، هەر بەم شێوەیەش لە نێو جیهانی دابڕاوی زەین و زاتی شاعیردا بخولێتەوە و گوتارەکەشی هەر تەنها گوزارشت بێت لە تار و تاڵی و تلاوەییەکانی خۆیەوە، دواجاریش دەبوایە وەرگر لە باشترین حاڵەتدا خۆی لەگەڵ تێکستدا ڕابێنێت یان خۆی بگەیەنێتە ئاستی تێکستەکان، بەبێ ئەوەی بەرهەمهێنی تێکست هیچ ئەرکێکی ئاکاری یان پێداگۆگی یان تەنانەت مرۆڤایەتیش بخاتە سەرشانی

خۆیەوە، بەگوێرەی ئەم میکانیزمە ڕادیکاڵەش بێت ئەوا دەتوانین بڵێین شاعیری ئەوسا تا ڕاددەیەکی زۆر شیعری هەر تەنها بۆ خۆی نووسیوە یان لە باشترین حاڵەتەکەیدا بۆ دەستەبژێرێکی نووسیوە کە پێی وابووە دەکرێت چەند تاکێك لەوان بتوانن تۆزێك یان بە ڕاددەیەکی دیاریکراو لە تێکستەکانی ئەو تێبگەن، بەم شێوەیە ئەزموونی تێکستکاریی شیعری کوردی لە پانتایەکی زۆر تەسکدا خولاوەتەوە، هەلی گەیشتن بە دارشتنی تیکستێکی سەرکەوتوو وابەست نەبووە بە وەرگرەوە، بەڵکو وابەست بووە بە کۆمەڵێك پێوەری ناشیعرییەوە کە ڕەنگە هەلومەرج و مجێزی دەستەبژێری پێشوو دایڕشتبووبێت، کۆی وەرگری میوانیش دەبوایە بە ناچاری خۆی لەگەڵیدا ڕابهێنێت، زۆرینەی ڕەهای تێکستەکانی ئەوسا پێمان دەڵێن تێگە و جیهانبینیی شاعیرانی ئەوسا پێیان وابوو دەبێت تێکستی شیعری بەم پێودانگە سەرهەڵبێنێت یان وەك چۆن گەیشتۆتە بەر دەستی وەرگر پێویستە هەر وابێت، بەبێ ئەوەی پرسیاری ئەوە بکات، بوونی مانای کۆنکرێت و ڕوونی بیرۆکە و ڕاستینەییەکانی ڕۆژانە و ناتەموومژاوی پێکهاتەی بنەڕەتی تێکست ڕۆڵێکی ڕەها دەگێرن بۆ تەنککردنەوەی ئەو بوارەی لە نێوان وەرگر و شاعیردا هەیە.

تەڵعەت تاهیر بە وردی سەرنجی ئەوەی داوە تیۆر و بۆچوونە ڕەخنەییەکان ڕاستەوخۆ کاریگەرییان بەسەر تێکستدا دەنوێنن، بە شێوەیەك دەبنە ئەندازەی پێشینە بۆ دروستکردنی تێکستی شیعریی، لێرەوە شاعیر پێچەوانەی زۆرانێکی زۆر لە شاعیران، زوو و زیتەڵانە لەوە تێگەیشت پرۆسەی شیعریی

جیددی و ئەزموونە ناوازەکان لە دەرەوەی تێزە ڕەخنەییەکان و تێگەیشتن لێیانەوە هەڵی دروستبوونییان لاوازە، زووتریش سەرنجی ئەوەی دا لێکدانەوە و شیتەڵکاریی و ڕاڤە ڕەخنەییەکان ڕاستەوخۆ دەبنە بەرچاوڕوونی بۆ ئەو ئەزموونانەی دەخوازن تازەکاریی شیعری بنێنەوە، زوو تێبینی ئەوەی کرد، کەوا پێوانە و پێوەرە ڕەخنەییەکان دەبنە سیستەم و ڕەوشەنساز و پێشینەی درەوشاوە بۆ بیناسازیی ئەو تێکستە شیعرییانەی بە نیازن لە پرۆسە سەرکەوتووەکانی شیعرسازیدا خۆیان ببیننەوە، تەڵعەت بە بەراورد لەگەڵ زۆرینەی هاوقۆناغەکەی وریاتر و وردتر لە چالاکییە ڕەخنەییەکان تێدەگەیشت دروستتر سوودی لە چەمکە ڕەخنەییەکان وەرگرتووە، نەوەك بە پێچەوانەوە تێبگات بەوەی تیۆری ڕەخنەیی و ڕێساسازیی و چالاکییەکانی پاشبەند و پاشەڕۆ و شوێنهەڵگر و شوێنکەوتەی تێکستی ئەدەبین، وەك چۆن لە حەزی هەندێك لەو شاعیر و نووسەرانەی ئەم جۆرە چەمکانە ئاوەژۆ دەکەنەوە.

تەڵعەت لە ڕێگەی ئەم وریایی ئەم وشیارییەی لە دروستناسینی دەرهاوێشتەی بیری ڕەخنەیی توانی ئەو ئەزموونە ناوازەیەی بێنێتە کایەوە، کە دواجار خودی چالاکییە ڕەخنەییەکان سەرسامی دەبنەوە و بیرۆکەی تازەتر لەسەر گوتار و تێکستەکانییەوە بینا دەکەنەوە، کەواتە کاریگەرییەکانی ئەزموونی شیعریی تەڵعەت هەر تەنها بە سەر جوانوەرگرانی ئاسایی و دەستەبژێرانەوە نایەت، بەڵکو ئەو جۆرە کاریگەرییانەی ڕاستەوخۆ بەسەر بیر و چالاکییە ڕەخنەییەکانیشادا هەڵدەکشێت،

بێگومـان تەڵـعەت لە خوێنـدنەوە و بەدواداچوونەکـانی بە نێـو بۆچوونە ڕەخنەییەکاندا، هەمیشە میکانیزمێکی تایبەت بە خۆیەوە هەبوو، ئەو نایەت سفت و سووك دیدە ڕەخنەییەکان بێ لێڕامان و بێ وردبوونەوە وەریانبگرێت و بەرکارییان بخات، یـان هەروا بە سـادە و سـاکاریی بۆچـوون و ڕاڤە ڕەخنەییەکـان و شـرۆڤە ئەدەبییەکان دوور لە هەڵسەنگاندنێکی وشیارانە بقۆزێتەوە، بەڵکو ئەو لە کـــانیی ڕۆحە شـــیعرییەکەی خـــۆیەوە دێـــت و وەك جوانناسێك بۆچوونەکان ورد دەکاتەوە، ئەوانەی لـێ دەڕنێـتەوە، کە لە هەلومەرج و تێکستنووسـیی ئەزموونەکەیـدا بە گونجـاوی دەبینێت، هاوکات لەو بۆچوونە هەڕەمەکییانەی جیای دەکـاتەوە، کە ناکرێـت لە شیعرسـازییەکەیدا جێگەیـان ببێـتەوە، تەنـانەت گەمەکانی داهێنان و بابەتەکانی تازەکاریی لە لای ئەوی شـاعیر خوێنـدنەوەی زۆر وریاتریـان بـۆ دەکرێـت، ئەمەش لەبەر ئەوی شاعیر کارەکییـانە بە نێـو شیعرسـازییدا دەخـولێتەوە، بەم شـێوەیە دەتـوانین بڵێـین دیـدی تەڵـعەت لە خوێنـدنەوی شـیعریی و ڕەخنەییدا لە ڕاسترین شێوەکانی خۆیەوە دروست بوونە، بەوەی ڕەخنەسـازی و بۆچـوونە تیۆریسـتییە ڕەخنەییەکـان، شانبەشـانی تێکسـتی شـیعریی و ئەزموونەکـانییەوە دەجـوولێنەوە، ئەم دوو کایەیە تەنها لە هەماهەنگی یەکتـردا دەتـوانن گوتـاری شـیعریی بـالا دروســت بــکەن و ئەکتیڤــی بــکەن، لە دەرەوەی ئەم هارمۆنیـایەی لە نێـوان هەردووکـایەدایە تێکسـت بـوونی نییە بە هەمــان شــێوە ڕەخــنەش بــوونی نابێــت، هەر ئەم تێگەیشــتنە دروستەی تەڵعەت بـوو، بـووە مـایەی ئەوەی بتوانێـت سـوود لە

پێـوەر و پێوەرسـازییە ڕەخنەیـی و بۆچـوونە تیۆرییەکـانەوە وەربگرێت و زانیار و زیتەڵانە بۆ تۆکمەکردنی ئەزموونە شیعرییە سـەرکەوتووەکەی بەکاریـان بهێنێـت، کە ئیمـڕۆ لەم کـۆمەڵە شیعرییەدا بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە و وردە وردە پێ دەنێتە نێو بەجیهانیکردنی تێکستەکانی.

ئـا لێـرەدا زیـاتر بۆمـان ڕوون دەبێـتەوە، کەوا کۆششـی ئەم تازەکارییە شیعرییەی تەڵعەت تاهیر بەم وەرچەرخانە شیعرییە پڕ داهێنان و تازەکردنەوەی تێکستی شیعری هەنگـاویکی ئاسـان و بـێ سـاتمە و بـێ کێشـە نەبـووە، هەروەهـا بـێ هەوڵ و بـێ بەدواداچوون و بێ خوێندنەوەی قووڵی ئێستای شیعریی کوردی و گەشەسـەندنەکانی دروسـت نەبـووە، هاوکـات لە دەرەوەی وردبـوونەوە لە تیـژە ڕەخنەیەییەکـان و دوور لە پێـداچوونەوە بە تیۆرەکـانی تێکستسـازیدا نەهـاتۆتە ئـاراوە، بەڵکـو پێویسـتی بەو هێپـۆتێزە کـۆنکریتە بـوو، لە ڕێـگەیەوە بتوانێـت سیاسـەت و ستراتیژی ئەم دەرچوونە سـەختە لە کۆتوبەنـدیی و دیلییەوە بـۆ ئازادی بەدەست بهێنێت، پێویستی بەو هێپۆتێزە شیعرییە بـوو، کە بە شێوەیەکی کارەکیـانە لە کـۆمەڵەیەکی شـیعرییدا بیخـاتە بەر دەستی وەرگـرانەوە، لێـرەوەش کـارەکەی تەڵـعەت تـاهیر تەواو نابێـت، بەڵکـو لە هەلـومەرجی ئەم ئەزمـوونە تێکستنووسـییەیدا، خۆی لە بەرامبەر بە گەنگەشەیەکی قورستر دەدۆزێتەوە، ئەویش مەرجی سەرکەوتنیەتی لەم دەستپێشخەرییە مێژوویەیدا، مەرجی پێکـــانی ئامانجەکـــانییەتی لە دەربـــازبوون و دەرچـــوون لە سیسـتەمێکی شـیعریی بـاوەوە بـۆ سیسـتەمێکی دیـکەی شـیعریی

جیاوازەوە، سیستەمێك كار لەسەر لە دروستكردنەوەی كەناڵی پێوەندیی شاعیر بە وەرگرەوە بكات تا ئەو ئاستەی وەرگر قبووڵی بكات، داهێنانی سیستەمێك هەردوو وەرگری ئاسایی و دەستەبژێر لەگەڵ جوانییەكانیی تێكستدا ئاشت و ئاشنا بكاتەوە، بێگومان ئەم پێوەندییەش وەك ئاماژەمان بۆ كرد دەبوایە لە سەر بنەمای ڕوونكردنەوەی هێڵ و ڕەهێڵەكانی زمانی تێكستەكەی بێت و بە ئاراستەی وەرگرەوە بێتە ئاراوە، ئەمەیان لە خودی خۆیدا وەك موغامەرەیەكی مەزن لە مێژووی شیعری كوردیی هاوچەرخدا دەمێنێتەوە، لێرەوە بۆمان بە دیار دەكەوێت كەوا ئەزموونەكە تەڵعەت تاهیر دوای ڕامانی قووڵ لە كۆی ئەو پنت و پێكهاتە بنەڕەتییانە شیعر پێك دێنن بە گشتی و شیعری كوردیی هاوچەرخ بە تایبەتی هاتۆتە ئاراوە، لە پاڵ ئەمانەشدا گەڕان و خولانەوە و خوێندنەوەی سەروسەودای ئەو ئەزموونە شیعرییە جۆراوجۆرانە بووە، كە لە هەناوی شیعری كوردی هاوچەرخدا لەدایكبوونە یان ئەوانەی لە سەرەخۆ لەبارچوون و سەروسەدایان نەما، لە نێو ئەمانە هەمووشیاندا گەڕانەوە بۆ بایەخی وەرگر و ڕۆڵی وەرگر وەك بەشێكی بنەرەتی لە نێردەسازیی ئەدەبیدا، كە ئەندازە و ڕێساكانی ئەم ئەزموونە دادەمەزرێنن.

ئەم ئەزموونەی تەڵعەت تاهیر كە لە ڕوونییەكی بێهاوتا و بێوێنەدا توانا مەزنەكەی نەك هەر وەك شاعیر بەدیار دەكەوێت بەڵكو وەك بوێر و پێشنیازكاری مۆدێلێكی تازە لە شیعری كوردیدا سەرهەڵدێنێت، كۆنكرێتی مانا و ڕوونی زمان و بابەتی

ڕۆژانە دەبنە ئێکسیری نووسین و زادەی دانپیانان بۆ مەزنی ئەزموونی شیعریی لە نێو پۆلێك لە هەوڵی جیددی دیکەدا، ئەم هەوڵەی تازەکاریی تەڵعەت تاهیر، ئەزموونێکی نامۆ نییە، بەڵکو لە ئەدەبی دیکەی زمانانی میللەتانی دیکەی جیهاندا جۆرە پێشینەیەکی بە چەندین شێوازی جیا جیا و جیاوازادا هەیە، تەنانەت هەریەکەیان سەرکەوتنی بەرچاویشی بەدەست هێناوە، هەر بۆ نموونە وەك ئەزموونی شیعریی ئۆرهان وەلی لە ئەدەبی تورکی، ئێریش فرید لە ئەدەبی ئەڵمانی و فازیل عەززاوی لە ئەدەبی عەرەبیدا. ئەمانە هەر یەکەیان لە لایەن خۆیانەوە لە نێو ئەدەبی زمانی خۆیانەوە، پرۆسەی ئەم تازەگەرییە شیعرییەیان بەڕێوە بردووە و توانیویانە ئامانجەکانییان لە ئاخێزگەی ئەم ڕوونکارییەدا سەرکەوتووانە بپێکێنن.

کۆی ئەم ئەزموونە شیعرییەی تەڵعەت تاهیر، دەبێتە گوتارێکی ناڕاستەوخۆ کە لە ڕێگەیەوە دەیەوێت بڵێت "شیعر لە بنەڕەتدا لە خەونی وەرگر و ڕاستینە و خواست و ویست و هەست و نەستەکانییەوە دروست دەکرێن، شیعر لەو هاوبەشییانەدا چێ دەکرێن، کە لەنێوان دیدی خۆی و جوانوەرگریی وەرگردا چرۆ دەکات و پاشان لە چوارچێوەی حاڵەتی شیعرییدا فۆرمی خۆی وەردەگرێت و دەنمێت، دواجاریش لە ڕێگەی ئێستێتیکناسیی شاعیر و پرۆسەیەکی تایبەتی زمانییەوە دیسانەوە بۆ خودی وەرگران دەگەڕێتەوە"، ئەم لۆژیکەی تێکستنووسینی تەڵعەت تاهیر دەمانگەڕێنێتەوە بۆ گوتە گرنگەکەی (ئومبێرتۆ ئیکۆ) وەختێك دەڵێت: "خەون نووسینە،

تەنانەت زۆرینەی نووسینەکانیش لە ڕاستیدا لە خەون زیاتر چیتر نینە". بەڵام خەونەکان لە تێکستەکانی تەڵعەت تاهیردا زادە و زێدی ڕۆژانەی گوزەرانی وەرگرانییەتی، نەوەك شێلەی شپرزەیی و وڕێنەسازی و دۆزەخبینیی و خودپەسندی بێت، یان وێناکارییەکانی ناخ و هەناوبینییەکانی شاعیر بێت.

دەرەنجامی کۆی ئەم گوتارە شیعرییەی تەڵعەت تاهیر و ئەزموونە بوێرەکەی لەم کۆمەڵە شیعرییەیدا، نەك هەر کاریگەریی بەسەر ئێستای ئەزموونە شیعرییەکانەوە دەبێت، بەڵکو ئەم کاریگەرییە هەڵدەکشێت بەسەر ئایندەی چالاکییەکانی ڕەخنەی کوردیش و بە جیددی دەیانخاتەوە بەردەم پێویستیی پێداچوونەوە بەو پۆلێنکاریی و ئەو خوێندنەوە کورتبڕانەی دەمێکی دووردرێژە فرچکیان پێوە گرتووە، پێداچوونەوەیەك هەوڵ بدات لەگەڵ تێکستە تازەکاندا ھاموشۆیەکی تازەی لێ دروست بێت، پێداچوونەوەیەك پایەی ڕێز بۆ خەون و خەم و خولیای وەرگر بگەڕێنێتەوە، پێداچوونەوەیەك، دواجار بڵێت شیعر ڕاستە لە پایەی داهێناندا زیندووە، بەڵام لە پێگەی بەهەندهەڵگرتنی بەهای وەرگردا زیندووترە، لە پرۆسەی تازەسازیشدا هەلی سەرکەوتنەکەی وابەستەی توانستی شاعیر و زیرەکی و حاڵەتە شیعرییەکەیەتی، نەوەك داهێنانەکەی بە بەردەوام هەڵکورماو بێت و لە قاف و قەوافی سیستێمی شعریی بەر لەخۆیەوە بمێنێتەوە. لێرەوە دەگەینە خاڵێکی گرنگ دەربارەی چالاکیی ڕەخنەیی لە ئاست ئەزموونەکەی تەڵعەت تاهیر، وەختێك ئەم هەموو ڕوونی و ڕەوانییەی تێدا دەبینین،

ئەویــش ئەوەیە، کەوا لەگەڵ هەمـــوو ئەو ڕوونکـــارییەی لە تێکســتەکانی ئەم کــۆمەڵە شــیعرییەی تەڵـعەت تــاهیردا بەدی دەکــرێن، ئەوا ڕەنــگە لە پرۆســەی لێکــۆڵینەوەی ڕەخنەییــدا بە شێوەیەکی ســانا و ســووك دەستەمۆ نەبن و هاوکــات نەکرێـت ڕاڤەیەکــی خێـرا بـۆ ئەزمـوونەکەی بکرێـت، بـۆ ئەوەی کلـیلە تەکنیکـــی و ئەبیســـتیمییەکانی بـــدۆزرێتەوە، ئەمەش چـــونکە شیتەڵکردنی پێکهاتەی کیمیای ڕوونی و ڕەوانیی زمانی تێکست زۆر ســـەختتر و قورســـترە لە هەڵوەشـــاندنەوەی ئاڵۆزییەکـــانی گوزارشتکردن.

تەڵعەت تاهیر لەم کۆمەڵە شیعرییەیدا، هێپـۆتێزی پرۆژەیەکـی ڕەهەنـدتەواوی تازەکـاریی شـیعری لە سـەدەی بیسـت و یەکـی ئەدەبـی کوردیـدا دێنێـتە ئـاراوە، بە شـێوەیەك وەرچەرخـانێکی ئاشـکرا لە پرۆسـەی شیعرسـازیی کـوردیی هاوچەرخـدا پێـک دەهێنێـت، تێکســتەکانی لە داهێنــانێکی بێــوێنە و تەکنیکێکـــی ناوازەدا توانیویانە لە نەریـتە شـیعرییە داخراوەکـان بتـرازێن و لە ئەنـدازە و دیزاینێکـی تـازەدا، مـۆدێلێکی درەوشـاوەی شـیعریی بسازێنن، بە زمـانێکی ڕەوان گوزارشـت لە گـوزەری مـرۆڤ و وردەواڵە و گرۆگاڵ و خولیا و خەمەکـانییەوە بکـات و دواجـار لە ئەزمـوونێکی بێهاوتـادا سـتایلێکی شـیعریی جیـاوازی لێـوە دروسـت بکـات، لێـرەوە پـرۆژەی ئەم تازەکـارییە بە ئیتیکێکـی مرۆڤدۆستانە و فۆرمسازییەکی تـۆکمەوە، ئەزمـوونی شیعرسـازی کــوردی لە قۆنــاغە بــاوەکەیەوە دەربــازی قۆنــاغێکی تــازەی دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەی فۆرمی گوتارێکی واڵاتر وەربگرێـت

و ڕێسا کانی شیاوی ئەوە بن لە پرۆسەی شیعرنووسیدا پێڕەو بکرێن و دواجار بتوانن لە بەهایەکی ئەدەبیی لۆکاڵییەوە و بە ئاراستەی بە جیهانیبوونەوە گەشە بکەن.



## بۆنی شیر

بە دار چوالەم گوت:
باسی خودام بۆ بکە خوشکم..
چرۆی کرد

**نیکۆس کازانتزاکیس**

## زێ زێ

دایکم
هەتا مردیش وایزانی سوعبەتە
لەم ژیانە تاڵەدا، تووشی نەخۆشی شەکرە بوویێت.

## ستایش

لینین بە خۆی و هەموو کتێبەکانی

ستالین و فیلمەکانی، هۆنیکەر و یاساکانی

تیشاویسکۆ و گوتارەکانی، تیتۆ و بانگەوازەکانی

ماو بە چاوی بچووک و بەڵێنە گەورەکانی

کاسترۆ بە خۆی و هەموو ئەدیبەکانی

هێندەی دایکم یەکسانخواز نەبوون

کاتێک لەناو مەنجەڵێکی مسی سپیکراوەوە

موعجیزەی لەئاو دەکرد و دەورمان دەدا

سێ هێلکەی کوڵاوی بەسەر حەوت منداڵدا دابەش دەکرد.

**ئادەم**

دایکمم بیر دەکەوێتەوە

سکم بە ئادەم دەسووتێ

دایکی نەبوو

کە دەرکرا هاواری بۆ کێ دەبرد؟!

## باتە

منداڵەکە لە پەنا عەبای دایکی دەڕوا

لە باوەشیدا پێڵاوە تازەکەی خۆی و

لە ڕوخساریدا پێکەنینێکی کۆنی من دەبینرێ.

## چوارچێوە

چەند جارێک تێبینیم کردووە

ئەو ماڵانەی وێنەی دایک هەڵدەواسن دیوارەکەیان تەقیوە

ئاخر جوانیی بێکۆتایی چۆن دەخرێتە چوارچێوەوە؟!

**قوربانی**

دایکم، بە ئاهی سارد دەروونی بووە سەلاجە
وەکو ئەوەی دەرمان بن
شرووبی فرمێسک و پاکەتی نەبوونی و قەترەی مەراقی
لە شوێنێکی وشک و لە ڕەفەی سەرەوەی ناخیدا
دوور لە دەستی منداڵەکانی هەڵدەگرت.

## بۆنی شیر

دایکمان، لە تەنیشت دایکی ناشت
مەلا هەر باسی ئاگری قیامەتی دەکرد
کەچی لە قەبرستانەکە تەنها بۆنی شیر دەهات.

## فرمێسک

فیتەرەکان، بە هەموویـان ئۆتـۆمبێلە کـۆنەکەی باوکمیـان بـۆ

چاک نەکرایەوە

شاگردێک دیاربوو حەزی لە کتێب بوو، گوتی:

حاجی گوێی مەدەیێ

لە هەورازی مێـژووەوە بـۆ دامێنـی ئێسـتا، لە نەوەی پـێش

نەوەکەمانەوە

فرمێسک دەخەینە پاترییەکەوە و ئەم نیشتیمانە پاڵ دەنێین

ئیش ناکا و ناکا.

## هابیل

ڕۆژ نییە لەم گەردوونە کۆمەڵە خۆری تر نەدۆزنەوە

ئەی نەمدەگوت

ئەو بەردە بچووکـــانەی لە پـــێڵاوی باوکمـــدابوون کە لە

کرێکاری دەگەڕایەوە

ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبنە هەسارە؟!

## میهرەبانی

بۆ لەبیرکردنی لۆچەکانی

خوشکەکەم، هەمیشە بە جلی ئوتووکراوەوە

باوکمی دەناردە مزگەوت.

## باسکە

باوکم پیر بووە، گوێی گرانە و چاوی کزە
چەندین ڕاستیمان لێ شاردۆتەوە تا وا تێبگا دنیا هێندە غەدار نییە
کە دەپرسێت: لە بێژەری تەلەفزیۆنەکە گوێم لە هەشتا و یەکێک بوو؟
دەڵێین: ئا، ئەوە گۆڵەکانی یارییەکە پێی دەڵێن باسکە، نازانێ قوربانیانی تەقینەوەیەکە
کە گۆچانەکەی بەر جەستەی سواڵکەرێک دەکەوێت، خێرا تێی دەگەیەنین کە کارگوزاری شارەوانی بووە
بەڵام، دوایین جار کە هەموو گیانی ببووە ئارد، چەندی گوتمان بابە ئەوە گەچی ئەو خانووەیە کە دراوسێکەمان دروستی دەکا
گوتی: نەخێر.. منداڵێک بوو یەخەی گرتم و گوتی سەموون.

## ڕەشەبا

باپیرەم
جەمەدانییەکەی توند توند دەبەست
دەبوایە لەو کاتەوە تێبگەم
ڕەشەبای ژیان، هەمیشە یاری بەسەر دەکا.

## نووح

دەڵێن، کە کەسێک تازە دەمرێت
مردووە کۆنەکان بۆ هەواڵپرسینی ئێمە سەردانی دەکەن
دوێنێ ناسیاوێکمان ناشت.. خەمی ئەوەمە ئێستا باوکم بۆی گەڕاوەتەوە
ئەو چیرۆکی نووحەی بۆ لافاو فێری کردین
لەم وڵاتە بەشی پەڕینەوە لە جۆگەڵەیەک ناکا.

## حەزێک بەردەوام دێتە دی

بێ ئەوەی کەس بزانێت، هەر یەکەمان لە ناخەوە شتێک ئەزیەتمان دەدا

هەیە زستانان بە بۆنی شێلمی سەر عەرەبانەیەک

کە کاتی خۆی بە ڕۆژە شیرینەکانی گەنجێتیی، تاڵی شێلمەکانی لابردووە

هەیە، بە دیمەنی سینی پاقلاوەی سەر سەری منداڵێک، کە کاتی خۆی ئەویش لێی ڕژاوە و هەتاهەتایە یادەوەرەی بۆ پاک ناکرێتەوە

هەیە بە بینینی عامودێک، کە کەس شعووری ئەوەی نییە فەرمووی دانیشتنی لێ بکات

وەک چۆن جاران خۆی بەرامبەر دەرگای دۆستەکەی دەوەستا و دەوەستا

من، لە منداڵییەوە بینینی خاکەناس ئەزیەتم دەدا

باوکم بیر دەکەوێتەوە کە لە باخی دەوڵەمەندەکاندا کرێکاریی دەکرد

ئەوسا بە دڵ حەزم دەکرد بمرم و ببمە خاکەناسێکی سووک
گەورە بووم و نەبوومە ئەو کەسەی دەمەوێ و تۆشم نەما
ئیتر خۆشبەختانە حەزەکەم هاتە دی.

**ئاوڕدانەوە**

شەڕەکانی گەورەبوونم دۆڕاند
ئای کە منداڵ بووم لەسەر پشتی بابم
چ سوارچاکێکی ئازا بووم.

## وەرزێک لە هەزار و یەک شەوە

ڕۆژێ دێ، من و کەر و پاشا هەر سێکمان دەمرین..
پاشا لە تووڕەبوون
کەر لە ماندووبوون
منیش لە خۆشەویستیی تۆ

**ژاك پریڤێر**

## هوجام سوورچی

دایکی هەر دەیگوت، وجام
ئێمەش بەبیرمان دەهێنایەوە کە ناوی هوجام سوورچییە
تا کوڕە بچووکەکەی بە دزییەوە گوتی
لەوەتەی سەریان بڕیوە، دایکمان دڵی نایە سەری ناوەکەی
بڵێت.

## چارەنووس

له مامۆستای جوگرافیاوه له کۆبانی

بۆ پێڵاو بۆیاخکردن له جادەی مەولەوی

خەمی ئەوەی بوو ئێستا قوتابییەکانی چی پێ دەڵێن

که دەرچوو، سێ لەسەر چواری گۆی زەوی ئاو نییه و

فرمێسکه.

## ماڵ

یەکدوو چین دەکا و دەڕووخێت

ئەو گەنجە، لە کونجێکی چایخانەکە

بەسەر مێزێک نووشتاوەتەوە و دێنێ و دەبا

بە پوولی دۆمینەش ئەم جیهانە دروستکردنی ماڵێکی پێ

ڕەوا نابینێ.

**له ستایشی نەوەی پێشوودا**

ئەم وڵاتە

جورئەتی ئەوەی پێ نەهێشتین

لە منداڵێک بپرسین

کە گەورە بوویت دەتەوێ ببیت بە چی؟!

## دایک

دوکاندارەکان لێی توورە دەبوون

کاتێ ئەو ژنە، کارتۆنی سابوون و کارتۆنی هێلکە و

کارتۆنی پڕ چەرەزاتی دەسکاری دەکرد

تا کەسێک پێشتر دەیناسی گێڕایەوە

لەو ڕۆژەوەی مێردەکەی منداڵەکانی لێ سەندووە

شێت بووە و هەموو شتێک دێنێ و دەبا، کەمێک لە لانک

بچێت.

## لۆکە

جووتیارەکە، گلەیی لە بەرهەمی گەنم و جۆکانی دەکرد
دڵم نەهات پێی بڵێم
لێرە برین هێندە زۆر بووە
باشترین شت چاندنی لۆکەیە لۆکە.

## خێمە

ئێزیدییە و لە منداڵییەوە دەیناسم
ئەوسا هەمووانی فێری دروستکردنی دارلاستیک دەکرد
دەیگـــوت: ئاســـانە، دوو دار دێتــین و وەکــو ژمــارە ٧ بە
پەتێکەوە دەیبەستین
ئەو ڕۆژە، لە کەمپی ئاوارەکانی عەربەت بینیمەوە
دارلاستیکێکی گەورەی دروست کردبوو، بەڵام ئەمجـارە لە
شێوەی ژمارە ٨
نایلۆنێکی بۆری وەک پێستی ئەم جیهانەی پێدادرابوو
ببووە چادرێک بۆ منداڵەکانی.

## هەناسە

دانە دانە، فووی لە میزڵدانەکان دەکرد و
بە پەتێکەوە لە مەچەکی خۆی دەبەست..
میزڵدانێکم بۆ کچەکەم لێ کڕی و لە دڵی خۆمدا گوتم
حاجی، بەس تۆ لەم وڵاتە هەناسەت بە خەسار نەچوو.

## سەربۆیاخکراو

دوای ڕاپەڕین

لەسەر سنوور، باوەشمان پیاکرد و چەپڵەمان لێدا

کاڵە ئەدیدایسە دڕاوەکەیمان وەکو پاپووجەکەی سەندریلا بینی

قۆپچەی کەتافەکەیمان لێ ببووە مرواری

دواتر بۆمان دەرکەوت، لە نیوەشەوێکی مێژوودا ڕای کردووە و

لەسەر پلیکانەی دۆڕانێکدا تاکێک کاڵەی لێ جێماوە

ئێستا هەموومان سەرقاڵی ئەوەین: ماڵ بە ماڵ دەگەڕێین و

ئەو کاڵەیە بە "پێ"ی نەهامەتییەکان تاقی دەکەینەوە.

## شێرپەنجە

لە خەستەخانەی هیوادا

چیمەنەکە بەرز بۆتەوە

باخەوانەکە سەری ڕووتاوەی منداڵەکان دەبینێ و

چەندی دەکا: دڵی نایە بیبڕێتەوە.

## بەڵێن

باوکی بە ڕووداوی هاتووچۆ مردبوو
منداڵەکەی لە کۆڵاندا بە خۆشییەوە بە هاوڕێکانی دەگوت
دایکم بەڵێنی پێ داوم
ئەمجارەیان باوکم بێتەوە
ئۆتۆمبێل نا، پایسکلێکی سێ تایەی لەوەی منی بۆ دەکڕێ.

## مانگ

لە شەوی جەژندا

ژنەکان، پەیتا پەیتا شەربەت و کولیچە و چەرەزاتیان ئامادە

دەکرد

برا گەورەکانیشی بۆ بینینی مانگ لە سەربان بوون

منداڵەکە دەیزانی مانگ لەکوێیە و نەیدەدرکاند

نەوەک دیسان مانگی سەر دەرگای ئیسعافەکەبێت و

کەسێکی دیکەش ببات

وەک چۆن باوکە نەخۆشەکەی برد و

بە مردوویی هێنایەوە.

## فەلافل

فەلافلێکی وشکی داینێ و ئێمەش بە نابەدڵی خواردمان
بەڵام، بۆ هەتاهەتایە تێر بووین
کە زانیمان خاوەن عەرەبانەکە هەڵەبجەییە و
نایەوێ کەسی تر بۆنی عەنبە و خەردەل بکات.

## تانکی سەربان

لەبەر دەنگی ئەو تراکتۆرەی ئاوی بۆ هێنابوون

سڵاوی ئێمەی نەبیست

ئەو مەلایەی دوێنێ باسی لافاوی نووحی بۆ دەکردین.

## توفاحەین

دوای ئەوەی  هەردوو بـــڕگەی دوا-ڕۆژی ئەو گەنجەیـــان
سووتاند
ئێستا ئێواران، لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەیخەنە سەر نێرگەلەیەک
و
بۆنی سێوی مەراق ڕۆژەڕێیەک دەڕوا.

## حافز

به دەستبەسەرداهێنانێک، سواڵکەرەکانمان ڕازی کرد
بۆ ماوەیەکی کەم قەمیسەکانیان وەرگرین
جەمەدانی ئەو پیرەمێردانەمـان هێنـا لەبەرخۆیـانەوە لەگەڵ ژنە
مردووەکانیانەوە دەدوێن
لە خەستەخانەکان، کەمامەی ئەو یوسفە بچووکانەمان هێنا
کەوتوونەتە بیری شێرپەنجەوە
کەنتۆرەکـانی خۆشـمان بەتـاڵ کـرد و قەڵاتێکمـان لە جـل
کۆکردەوە
ئەم نیشـــتیمانە حـــافزە هەمـــووی بـــۆن کـــرد، بینـــایی بـــۆ
نەگەڕایەوە.

## پیجیم

ڕۆژانه بڕۆ بازاڕ و ببینه
پیرەمێردێک، وەکو تەلەفۆنی عموومی حەبی گەورە گەورە
قووت دەدا و لە هەناویدا غڕەیان دێ و بە تەسبیحەکەی
هەتا ژمارە سەد و یەک لێ دەدا و ژیان وەڵامی ناداتەوە
ژنێک و کچەکەی، لەژێر لچکی یەک عەبادا بەدیار
فرۆشتنی پاکەتێک پیلی باریکەوە دانیشتوون
بێ ئەوەی بزانن لێرە نەهامەتی کۆنترۆڵی نییە
گەنجێک ڕوخساری کوژاوەتەوە و لایتی شەحن
دەفرۆشێت
ئەم دیمەنانە لە قاپی ناختدا لەگەڵ دەسکێک نەعنای مەراق
بجنە و وردیکە، دواتر چاوت وەک لیمۆ بگوشە و کەمێک
فرمێسکی بەسەرداکە
ئەوجا تێدەگەیت، بۆچی ئێواران تەنها خواردنی زەڵاتە
باشە.

## ئیجه

مێرده‌که‌شی له‌سه‌ر هاتنه‌وه‌یه
فاسۆڵیای له‌ ئاو کردووه‌ و له‌وکاته‌وه‌ ناوێرێ بیشواته‌وه‌
مه‌نجه‌ڵه‌که‌ ده‌بێته‌ به‌له‌م و که‌وگیره‌که‌ ده‌بێته‌ سه‌وڵ و
ده‌نگی ساحیبه‌ی هه‌واکه‌ش ده‌بێته‌ ڕه‌شه‌با
ئه‌و ده‌نکه‌ فاسۆڵیانه‌ی سه‌ر ئاویش که‌وتوون، ده‌بنه‌ کوڕ و
کوڕه‌زاکانی.

## کلیل

بەدەم پیاسەوە
کچەکەم پرسی: باوە، ڕاستە ئەم وڵاتە بۆ ژن زیندانێکی گەورەیە؟!
دەنگی لەرینەوەی تۆپەڵە کلیلی کەمەری ئەو پیاوەی لەپێشمان دەڕۆیشت
قسەی پێ نەهێشتم.

## غەدری نووح

بەڵێ، ئەوان لە ئێمە باشترن

سەدە و نیوێکە ئەم هەسارەیە بەدەست ئێمەوەیە، ئەتۆم و کیمیاوی و کونی ئۆزۆن و تووانەوەی بەستەڵەکەکان و بێدادی و شەڕی زۆرتری لێ کەوتەوە

کەس بیستوویەتی، کرمێک ئیرەیی بە فڕینی کۆترێک ببات؟!

پشیلەیەک خۆی بە کۆمەڵە جووجکەیەکدا بتەقێنێتەوە؟!

بازێک ئەنفالی کەروێشکەکانی کردووە؟!

ئەسپێک بە هێسترێکی گوتووە تۆ لە بنەماڵە نیت؟!

تەگەیەک هەبووە بزن بکاتە سەبایا؟!

قەت بووە بە هەشت گا، دەستدرێژی بکەنە سەر مانگایەک؟!

تیمساحێک، پێستی پیرەمێردێکی کردۆتە جانتا؟!

بولبولێک، بۆ دەسەڵاتی شێر چریکاندویێتی؟!

درەختێک، کرێی هێلانەی لە باوکی دوو بێچوو وەرگرتووە؟!

نەورەسێک، هەر بۆ خۆشی بە نارنجۆک ماسی گرتووە؟!

سەگێکی تیرۆریست هەبووە؟!

ماکەرێک هاوسەرگیری لەگەڵ نێرەکەرێکدا کردووە بۆ باشترکردنی گوزەرانی؟!

ئاسکێک بوختانی بە دەمی پڵنگێک کردووە بۆ وەرگرتنی ڕەگەزنامە؟!

ئەوە ئێمەین

لەگەڵ دوادڵۆپی شیری دایکمان چیرۆکی دڕندەییمان دەست پێ دەکا و

ئەولادەکانی دارستان دەکەینە تابووت

ئێمەین ترسناکین

کەچی ئاگادارکردنەوە تەنها لەسەر پاکەتی جگەرەکانماندا هەیە.

## جەمەدانی

ئاهە ساردەکانی فریای نەکەوت
ئەو پیرەمێردەی
لەبەردەم بازاڕی نیشتیمان کلێنسی دەفرۆشت
بە لچکی جەمەدانییەکەی ئارەقەی نێوچەوانی دەسڕی!

## تەمتوومان

بکێشە هاوڕێم

جگەرە بکێشە و بەرچاوی هەردووکمان بکە دووکەڵ

ئەم جیهانە هی ئەوە نەما بە ڕوونی بیبینین.



**به ڕووی ئەم جیهانە ناشرینەدا**
**جوانیت بەرز دەکەمەوە**

ئەگەر تۆ بەرەبەیان بیت
یەکەم باڵندە منم

ئۆکتافیۆ پاز

## ڕاپۆرت

من ئاوا دەمرم
لەسەر بەرزایی پیتی ئەلفی دوایین خواحافیزیمان
بەرەو ڕابردووت خۆم فڕێ دەدەم
لە کەوتنە خوارەوەمدا
لە پەنجەرەی هەر ساڵێکی تەمەنت تەماشات دەکەم
ئەو ساڵەی یەکترمان ناسی و تۆ چایەکی تاڵت بە لەتێک پاقلاوە خواردەوە و منیش بۆ هەتاهەتایە جیاوازیی نێوان پەنجەکانی تۆ و زنوودی ستم بزر کرد
ئەو کاتەی بەناوی فێرکردنی زمانی عەرەبییەوە ڕستەی سەر ئاوێنەی سایەقم پێ حونجە دەکردیت کە دەڵێت: ئاگاداربە مەودای دووری ناو ئاوێنەکە ڕاستەقینە نییە
بێ ئەوەی پرسیاریش بکەیت دەمگوت: واتا کەسانێک هەن دووریش بن، نزیک دیارن

ئەو ساڵەی خوازبێنیت کرا و بە شەرمەوە پەرداخێک ئاوت بۆ کەسێک برد، من نەبووم
ئەو ساڵەی تەسبیحە قەزوانەکەی منت لە باسک دەئاڵاند و منیش سەد و یەک جار دەمگوت: غەریبیت دەکەم
ئەو ساڵەی بە سووراو ناوی منت لەسەر قۆڵ دەنووسی و بە گەرمای هاوین ناچار بوویت بە کراسی قۆڵدرێژەوە بگەڕێیت
بەردەبمەوە و لە مێژووتدا بەردەبمەوە، هەتا ڕۆژی لەدایکبوونت لە ناوەڕاستی باخچە بچووکەکەی ماڵتان بە عەرز دەکەوم و نزیک ئەو خزمانەی بۆ دۆزینەوەی ناوێکی خۆش بۆ تۆ کۆبوونەتەوە: دەمرم.

## شریتی ڕەش بۆ چوارچێوەی وێنەیەک

جلی ڕەشت زۆرە دەزانم
لە کراسێکت، لە کەوایەکت پارچەیەک قوماشی ڕەشم بۆ هەڵگرە
ئێمە کاتی خۆی، خاوەنی سامانێکی زۆر بووین لە ڕەش
دایکم کە مرد عەبایەک و چارۆکەیەکی ڕەشی بۆ جێ هێشتین
هەمووی من بە هەدەرم دا، بە دزی خوشک و براکانمەوە
هەر ڕۆژەی پارچەیەکم دەبرد
بیستبووم ڕەش خەم هەڵدەمژێ و نایداتەوە، بەو هۆیەوە
پارچەیەکم دەنایە بەر پشتێنی هەر پیرەمێردێک، کە بمزانیبا
لە شەڕێکدا تەرمی کوڕەکەی گەڕاوەتەوە
پارچەیەکم وەکو نیشانەی کاپتن لە قۆڵی ئەو منداڵە ئێزیدییە بەست
کە بەو سەرمایە، بە فانیلەیەکی هەڵبژاردەی فەرەنساوە، لە قوڕاوی کەمپێکدا خوشکە بچووکەکەی لە کۆڵ کردبوو.

هەر ژنێـک پرچـی سـپی ببـا، پـارچەیەکم لە نێـوچەوانی دەبەست و گەنج دەبۆوە
قژی دەبریسکایەوە
لە دوایین پارچە، لافیتەیەکی بچووکم بـۆ ئەو سـاوایە پـێ نووسی
کە لەبەر دەرگای ماڵێکدا فڕێ درابوو
عەبا و چارۆکەم تەواو کرد
ئێستا لە باشیم نییە، بە خاوەن پرسە و عاشقەکان دەڵێم
بەرگە بگرە، ئەمە سونەتی ژیانە
کەچـی خـۆم بەرگە نـاگرم و بەم نزیکـانە بـێ تـۆیی دەمکوژێت
کە مردیشم، بۆ سەر چوارچێوەی وێنەکەم
لە کراسێکت، لە کەوایەکت پارچەیەک قوماشی ڕەشـم بـۆ هەڵگرە
پارچەیەکی بچووک، هێندەی ناو لەپـی ئەو سـاوایەی فـڕێ درا
وەک من و تۆ، کە بۆ یەک نەبووین و هەر یەکەمان لەبەر دەرگای ماڵێکدا فڕێ دراین.

## دەفتەری ئەعمال

لەپێش چاومە
لە ئاخیرەتدا، ئەو فریشتەیەی لە تەنیشتم دەڕوا
کە دەبینێت چاو بۆ کەسێک دەگێڕم
هەموو ڕۆحم شوختە و دەمم تاڵە، قلە هەنجیرێکم دەداتێ و دەپرسێت
مادام بۆچی پێش ئەوەی بمریت سلاوێکت نەنارد بۆ ئەو ئینسانەی
لە دەفتەری ئەعمالتدا ڕۆژ نییە دوعات بۆ نەکردبێ؟!
بە پشتی دەست ئارەقەی نێوچەوانم دەسڕم و بە هێواشی لەبەرخۆمەوە دەڵێم
لە عینادی برام لە عینادی..

## خەندەی تەڕ

وەک ئەو دینارە ئاسنەی
خزمێکمان لە کاتی ناشتنی داپیرەمدا پێی دام و دڵخۆشی کردم
ناوی تۆم خستۆتە ناو دەستمەوە و توند گوشیومە
هەرکە تووشی شکستێک دەبم
ناو لەپم دەکەمەوە، سەیرێکت دەکەم و پێدەکەنم.

## فێڵ

زۆربڵێ بوومە
هەر یەکێک ببینم تۆ بناسێت
دەبێ ئەحواڵی پەنجا کەسی لێ بپرسم
ئینجا لەنێویاندا بتشارمەوە و
هەواڵێکی بچووکی تۆم دەستکەوێ.

## بیرهاتنەوە

لە هەموو شتێک ڕازیم، تا ئەو کاتەی بیرم دەکەوێتەوە تۆم
نەماوە
یەکسەر هەست بە زبریی خۆم دەکەم
وەکو ئەو پارچە پەتەی لە ملی خنکاوێکدا بەئاگا دێتەوە
کە ئیتر نەبوو بە ملوانکە.

## ڕەفە

لەگەڵ بارگە پێچانەوەی ئازیزێکم
منیش بەشێک لە ڕوخسارم قەد دەکەم و دەبێتە لۆچ
خەریکە دەگەمە ئەو باوەڕەی
لۆچەکانی نێوچەوانی مرۆڤ
ڕەفەی یادگاریین.

## شکست

گلەیی لەو ژنانە مەکە تەوقە ناکەن
هەیانە لە من دەچێت
لەوەتەی ئازیزێکی لەدەست چووە
پەنجەکـــانی تەنیـــا بە کەڵکـــی ئەوە دێـــن لە پەشـــیمانیدا بیگەزێت.

**بارانی ڕەش**

لە دەرگای سلاویکەوە دیتە ناو ژیانتەوە
دەسکاریی ناخت دەکا
هەموو ئەو کەلوپەلانە لە هەناوتدا دەشکێنێت
کە تەمەنێکە لەگەڵ کەسانیتردا ڕێکت خستوون
دواتر ئەو کاتە جێت دیڵێ
کە بەکەڵکی خواردنی کەس نەماویت
ڕێـک وەک ئەو میـوەیەی لە تـابلۆیەکی زەیتیـدا بـریقەی نەماوە.

## میراتگری حەبیبە

ئەوسا گەنج بووم، برازایەکی بچووکم هەڵدەدایە ئاسمان و دەمگرتەوە
پێدەکەنی و بە پێکەنینی پێدەکەنیم
باوکم لەگەڵ ئەوەی زۆر کەمدوو بوو، دەیگوت: تۆش بە منداڵی حەزت لەوە بوو هەڵتدەم و بتگرمەوە
لەوساتەوە، هەستم کرد جارێک لەو جارانە هەڵیداوم و نەیگرتوومەتەوە
ڕۆیشتووم.. پارچەیەکم بۆتە ئەو گەنجە ئەنفالکراوەی، سی ساڵە هەموو شەوێک پیرێژنێکی گەرمیانی جێگەیەکی بەتاڵ لەتەنیشت خۆی ڕادەخات و چاوەڕێی هاتنەوەی دەکات
پارچەیەکم بۆتە ڕوخساری ئەو دۆستەی، پیرەمێردێک لەبەر دەرگای مزگەوتێکدا بەدیار فرۆشتنی پاکەتێک مووسەوە

لەبەرخۆیەوە حەیرانی بۆ دەڵێت.. بێئاگا لەوەی ئێستا لەم جیهانەدا ناوک نا، باو باوی سەربڕینە. پارچەیەکم بۆتە کتێبێکی عەشق لە دەستی ئەو ژنەی لە ماڵەوە بە ناوی هێلانەوە کەوتۆتە تەڵەی هاوسەرگیرییەوە و دەیەوێت تێبگا: کونی دەرگا بۆچی لە شێوەی دڵۆپێک فرمێسک دروست کراوە!

پەراسووەکانم بوونەتە شیشی مەحەجەرەی ئەو پردەی لە چوارڕیانێکدا بە سۆزی باپیرەیەک بەسەر مندالە کلێنسفرۆشەکاندا پشتی چەماوەتەوە

پارچەیەکم بۆتە پشیلەیەک، بێچووە سەگێک لە حەوشەی ماڵی ئەو هەتیوانەی باوکیان لە شەڕەکان، لە خەستەخانەکان نەگەڕانەوە

کەروێشکێک، مریشکێکی لاواز لە سەربانی ئەو ماڵانەی منداڵیان نابێت و

وەک قەرەبوو، میهرەبانییان بە ئاژەڵ دەبەخشن

بە دنیادا پەرت بووم، تا لە کۆتایی تەمەنمدا تۆم ناسی و خۆشم ویستی و پارچە پارچە بەسەر تۆدا دەباریم و دەتگرتمەوە.

بیرتە کە دەتگوت: ئەو پەلانەی سەر مەچەک و برینی سەر

دەستت هی پرووشکی ڕۆنی قرچاو و ئێشی ناومالّن، من
گاڵتەم پێ دەهات و تۆش تووڕە دەبوویت!
ئاخر، دەمزانی ماک و برینی گرتنەوەی پارچەکانی منن
دەتگرتمەوە و کۆت کردمەوە و بوومەوە گەنجەگەی
جاران
ئای
بۆچی لە سەردەمێکدا گەنجت کردمەوە
کە هەڵدان و گرتنەوە نا، تەنها بە کەڵکی تێهەڵدان دێت؟!

## دەرکردن

ئەگەر یەکێک گوتی: تۆ شایەنی کەسێکی لە من باشتری
بزانە بە یەکجاری نایەتەوە
هەمان فێڵی ئەو باوکەیە، پشیلەیەک لە ماڵ دەکاتە دەرەوە
و
بە منداڵەکەشی دەڵێت: دایکی هات و بردیەوە.

## نواندن

ئەوانەی وەکو من ئێوارەیان خۆش دەوێ
پەیوەندی بە نواندنی ڕۆژانەیانەوە هەیە
بێ ئەوەی پرسیاریشیان لێ بکرێت
لە دووریی ئازیزێک زوو زوو لەبەر خۆیانەوە دەڵێن: باشین باش، هەروا دەبێ
شەویش وەکو پەردەیەکی ڕەش دێت و کۆتایی بەم شانۆگەرییە دێنێت.

## خۆڕسک

خۆشەویستیم، پەیوەندی بە باشیتەوە نییە
سبەینەی دووشەمە لەبەردەم سجنی مەحەتە ببینە
بە دوو لەتە کەبابی سارد و نانی تیری بە فرمێسک تەڕکراو
و پاکەتێک جگەرەی غەمدانەوە
پیرەژنێک چاوەڕێی بینینی کوڕە بکوژەکەی دەکات.

## ئۆقره

هەر تۆ نەبوویت، بۆ ئەوەی کەسێک عەشقی پێ بگا
دەتزانی پێویستی بە قوڵپی چەند گۆرانی هەیە؟!
هەر تۆ نەبوویت، پێت وابوو بە ئەزموونیت و
تێدەگەی ڕوخسارێکی گرژ چەند کەوچک خەندەی
دەوێ؟!
ئێستا خێرە غیرەت ناکەی لە چاوەڕوانی ئەودا، سەرهەڵبڕی
و
ڕووبەڕووی سەعاتێکی دیوار ببیەوە؟!

## سەمای مەرگ

بە من نا، خەمی تۆ تەنها بە جریوەی خێرای ئەو چۆلەکانە
دەنووسرێتەوە
لە بازاڕی ئیسکاندا، بەسەر تەلی ئالۆزکاوی مۆلیدەی
کارەباوە بە ڕیز هەلکوڕماون و
لە دوورەوە تەماشای گەوزینی ئازیزەکانیان دەکەن
لەناو مەنجەڵێک کێشکەی کولاودا.



## بۆنی گوڵەهێرۆ

پێی گوتم: لە کونی دەرزی دانیشە و شوێن نەگۆڕیت..
گەر دەزوو هات بەرت نەکەوێ، گەر دەریشچوو لێ نەگەڕێی
لەگەڵ ئەوەشدا بەختەوەر بە، چونکە من تەنها مرۆڤی بەختەوەرم خۆش دەوێ.

عەبدولڕەحمان داخل
هەڵۆی قورەیش

## ئەربیل

ئەو بەیانییەی
بە بینینی تابلۆی ئۆتۆمبێلێکی ژمارە ئەربیل
دڵم داخورپا
زانیم تەواو خۆشم دەوێی.

## در

زمان هێندە بە شوێن جوانیتدا ڕای کردووە
پیتە قەڵەوەکانی لاواز بوونە
بۆیە جار جار بە هەولێری بانگت دەکەم: درەکەم..

## قەرات

کە تۆم نەما ئەوجا زانیم
خەڵک بۆ پیاسە ناچنە سەر قەڵاتی هەولێر
هەر یەکە و ڕووەو گەڕەکی ئازیزێک دەوەستێ و
وەکو سەربازێکی پیر، لە مەیدانی شکستەکانی خۆی دەڕوانێت.

## دڵەکزە

لە پشت سەیتەرەی هەولێر، لە بەرزاییەکانی کەسنەزان
لە سەرچنار، لەسەر ئەزمڕ
سەرەتا لەنێوان هاوڕێکاندا لەگەڵ زەڵاتەدروستکردن
بە تووڕەییەوە باسی بێمانایی ژیان و نادادپەروەری و
پێویستیی جێهێشتنی ئەم وڵاتە دەکرێ
دواتر سەری شووشەکانی بادە دەکرێتەوە و قوم لە دوای
قوم بابەتەکان دەگۆڕێن بۆ یادەوەری و گۆرانی
منیش وام.. لە خەو هەڵدەستم دوای هەندێ سڵاوی عادی
بە بێزارییەوە وەکو قوتوویەکی بەتاڵ
بەرەو دەوام غلۆر دەبمەوە و ئیمزایەک لەسەر بەیانییەکی
دیکەی بێ تۆیی دەکەم
دواتر یەکدوو جار لەبەرخۆمەوە ناوت دێنم، یادێکت
دەگوشم و دەیخۆمەوە و جیهان دڵەکزێی نامێنێ
ئیتر.. هەموو شتێک باش دەبێت.

## تەوقیت

لای من سبەینان شەش دەقە زووتر ڕۆژ هەڵدێ
بە تەوقیتی سلێمانی خۆشم دەوێی
لای تۆ ئێواران شەش دەقە درەنگتر ڕۆژ ئاوا دەبێ
بە تەوقیتی هەولێر لام بمێنەوە.

## پاسەوانی خەون

لە گەنجیمدا، لەژێر قەڵاتی هەولێر جارێکیان بە ڕێککەوت
کتێبی ئەفسانەکانم کڕی
ئەوسا نەمدەزانی لەبەرچی سەدان جار چیرۆکی ئەو پیاوە
سەرسپییەم دەخوێندەوە کە دەیتوانی خۆی بۆ هەموو شتێک
و هەموو ڕەنگێک بگۆڕێت
کە درەختێکیان دەبڕیەوە، خۆی دەکردە درەختێکی
دراوسێی و هانی ڕەگە بڕاوەکەی دەدا وەکو ژنێکی
میهرەبان نەوەی لقوپۆپی تر بخاتەوە
کاتێ قومرییەکیان ڕاو دەکرد، بێ ئەوەی مێینەکە بزانێت
خۆی دەکردە قومرییەکی نێر و بە دەنووکی پڕ خواردنەوە
دەگەڕایەوە هێلانە
مامزێکی بدیتایە لەبەر دەنگی دووری پڵنگێک گوێی
هەڵخستووە و ناوێرێ بە ئیسراحەت بنجەگیایەک بخوات
خۆی دەکردە مانگایەکی بە تەمەن و لە تەنیشتی دەوەستا و
دەیگوت: بخۆ کچم.

که گەیشتمە ئەم تەمەنە ئەوجا زانیم بۆچی هێندە ئەو چیرۆکەم خۆش دەویست
کە دڵنیابوومەوە ئیتر بۆ یەکتر نابین.. ئێستا وەک ئەو پیاوە سەرسپییە تەنها دەتوانم خۆم بگۆڕم ببمە کەسێک کە زۆر لەمێژە حەز دەکەیت ببینیت
ببمە گوڵێکی ئاسن لە دەرگای حەوشەتان
خۆم بکەمە ئەو دوکاندارەی میوەی لێ دەکڕیت
بەس دەتوانم ڕەنگی پێستم بکەمە هەمان ڕەنگی ئەو قەنەفەیەی لەسەریدا تەماشای هەواڵەکانی ئەم جیهانە وێرانەیە دەکەیت و
لە تەنیشت تۆم و نامبینیت، زوو زوو دەچرپێنم
غەریبیت دەکەم
ئاوڕ دەدەیتەوە کەس نییە.

## خۆشەویستی و ترافیکی سوور

ئەو کاتەی وەک دەنکە شقاتەیەک دەتەوێ بە ڕەشەبای سلێمانی بڵێیت منیش هەم
ئەو کاتەی لە هەڵکۆڵینی قەڵاتی هەولێر دەترسیت نەبادا ئەو نامانە بدۆزنەوە کە نەتوێراوە بیاننێریت، ئاشکرا بێت قەناتی ئاو لە بەستۆڕەوە نا، لە هەردوو چاوی تۆوە هێنراون
کاتێک بە بینینی شێوەی دڵ لەسەر کاپاچینۆیەک سکت بە خۆت دەسووتێ و بە پەلە هەر بابەتێک بێت خێرا بەشداری دەکەیت تا هاوڕێکانت هەستت پێ نەکەن
کاتێک بۆ دۆزینەوەی بیانووی تووڕەبوون لەو ئازیزەت
وەکو ئەو منداڵانەی قوتووی سێڤن ئەپ دەدەنە بەر شەق
وەکو سواڵکەر وتەی ناوداران لەبارەی بڕوا بەخۆبوونەوە کۆدەکەیتەوە و هەموو هەڵە و قسە ناخۆشەکانی دەژمێریت کەچی بەشی دوو ڕۆژ دوورکەوتنەوەت ناکەن
تۆ وەکو جارانی من مەکە.. نامەیەک بۆ خۆشەویستەکەت بنێرە و بڵێ
ئێستا
هەر ئێستا خۆشم دەوێی.

## ئەو کەسەی لە یادەوەریمدا پیاسە دەکا

بە خەیاڵیش
چاوەڕێی ئەو قەرەبووە باشە نەبووم
لەو وڵاتەی هەموو شتێکم تێدا ون کرد
تۆ بدۆزمەوە.

## دیمەن

لێشت دوورکەومەوە
هەر ئەوەیە، چۆن شێوەکار یەکدوو هەنگاو دەکشێتەوە و
تەماشای تابلۆکەی دەکات.

## کولیچە

کە پێدەکەنیت

دوو چاڵی بچووک لە ڕوومەتت پەیدا دەبن

دەڵێی شوێنپەنجەی دایکمە لەسەر کولیچەی جەژن.

## باوەش

پێم خۆشە دڵخۆش بیت
وەک ئەوەی جاران درهەمێکم لەناو جۆگەڵە دەدۆزییەوە
وەک ئەوەی جاران، عەسران
منداڵێکی خزممان لە کۆشی دایکم لادەچوو و خێرا خۆم دادەنیشتم
یان باوکم نەعلێکی تێدەگرتم و
بەر ئەو میوانە دەکەوت کە وێڕای ئەوەی جەژنانەی نەدەدا
پێی گوتبووم
بۆ نوێژ ناکەی؟!

## شوێنی ددان

بەو پێکەنینەشت ڕازیم
بە گازێکت، لەسەر سێوێک دەردەکەوێ.

## نازم غەزالی ڕاست دەکا

ڕەنگە گەنمییەکەت بکرێتە کولێرە بەشیساڵێکمان دەکا
باشە نابێت شەو لەژێر ساباتی قژتدا شەونخوون بین و
کە ڕۆژ بۆوە بە هەنگوینی چاوت و
قەیماغی کوڵمەت نانی بەیانی بخۆین؟!
نازم غەزالی ڕاست دەکا.

## خوان

سفره سەری لێ تێکچووە، لەنێوان برنج و ددانی برنجیت
کامە لە پێشتایە و کامە لە دەمتایە
کشمیش شەرم لە شیرینیت دەکا و دەیەوێ نهێنیی مزربوون
لە قەیسی بزانێ
سووپەکە سوور و سوێر هەڵگەڕاوە
لە حزوورتا، تەنیا ئاو شەڕەفمەندانە بێ بۆن و تام و ڕەنگ
لە سوراحی پشت گوڵدانەکە مەنگ بووە، پەنیری پارمیزان
لە سوێی زەردیی لاجانگت تواوەتەوە، مەعکەرۆنە لە
شێوەی هێڵەکانی سەر لەپی دەستت پێچیان خواردووە
ئەوەی گوناحە مریشکە برژاوەکەیە، بەر لە سەربڕین تۆی
نەدی
کانزاکان شەڕیانە
چەتاڵەکان لە خەمی ئەوەدا کوورِ بوونەتەوە بۆ نەکراون بە
زنجیری جانتاکەت

کەوچکەکە ئیرەیی بە گوارەکەت دەبا لە گوێتایە
گوارەکە ئیرەیی بە کەوچکەکە دەبا بەر لێوت دەکەوێ
ئەڵقەی بیبەرەکان
سـەوزیی کـاهووەکە بە وردە دەمارەکـانی ڕوومەتـت
دەگەیەنن
خاڵی گەردنت وەکو کونجی دەخەنە سەر نانەکە
کەس تێناگا: کامەتان جەستەیە و کامەتان خواردن؟!

## پێشنیار

جوانتر نەبوو تفەنگ و تەنەکەی تانکەکان بدەین بە تۆ
تاسکلاو و خەزێم و خرخاڵی لێ دروست بکەیت
ئەبجەدییەت بە پیت و خاڵەوە بکەینە گۆشتەوە
وەکو مووروو بە نینۆکت هەڵیاندەیت و
بیانخەیتە چاڵی ماناوە؟!

**هەوار**

زۆرم بیر لێ کردەوە

جەستەی تۆ تاکە ماڵە بۆ نیشتەجێبوون بشێت.

## خەوتووی ناو ئاوێنە

له قاوەخانەکە دانیشتبووین

قسەت دەکرد

هیچی لێ حاڵی نەبووم

دەنگت دەکەوتە ناو شەکردانی مێزەکەی نێوانمانەوە.

## عەین

پڕ بە دڵت قسە بکە

چ کارمان بە جوداکردنەوەی حا و عەینە

مادام وشەی خۆشم دەوێی

ئەو دوو پیتەی تێدا نییە.

## ناخ

شایەتی ناوێ

بە دەنگی پێکەنینتەوە دیارە

قەفەسی سینگت پڕە لە باڵندە.

## حەسوود

دراوسێکانم

وا دەزانن بۆ وەرزش سبەینان ڕادەکەم

نـا، مـن تەنیـا ئیرەیـی بە ئەسـپی نـاو تـابلۆی مەتـبەخەکەت

دەبەم.

## بەڵگە

گەر توانیت

شتی جوان لەبارەی کردارە خراپەکانی کەسێکەوە بنووسیت

بزانە کە خۆشت دەوێ.

**لێکدانەوە**

لەسەر تەنیشت دەخەویت؟

ئەوە بۆیە لە دیواری ژیانتدا تابلۆیەکی خوارم.

## تابلۆ

به خێرایی ماڵئاواییت کرد و چوویته ناو مەسعەدەکەوە
سەرباری قسەی خەڵک
پارچەتەنەکەش فێربووە تۆ لە من دوورخاتەوە.

## بەراورد

ئەو مێروولەیە دەڕۆیشت و
بۆ لەتە توێکڵی گوڵەبەڕۆژەیەک کتوپڕ گەڕایەوە
تۆ بەقەد هەتاوێک یادەوەری درەوشاوەت لامە و
بە خەیاڵیشتدا نایە.

## بینین

سووتانی من لە لای تۆ
وەک بریسکانەوەی هەتاوە لە عەینەکی ڕەشی حافزێکدا.

## لەززەت

تووڕەبە
تۆ دەڵێی قاوەیت
تا هەڵبچیت تامت خۆشتر دەبێ.

## تێرنەبوون

نانەکەم بە دڵ نەکەوت
کە ئاوێنەی شکاوی مەغسەلەی چێشتخانەکە
درزی خستە جوانیتەوە.

## لەرینەوە

گەیشتم بەم تەمەنە
تا ئێستا هەر قسە گرفتی بۆ دروست کردووم
بە تەنها تۆ بێدەنگییەکەت.

**ئاشتەوایی**

ئاشتیت بەخشیوەتە یاسای دارستانیش
کە دەخەویت
دەستی پڵنگی سەر بەتانییەکە
دەکەوێتە سەر شانی کەروێشکەکەی تەنیشتتەوە.

## غەدر

بۆ ئەم بەهارە
کراسی شەرابییت کردووە
ئێ دادە گیان بۆ ئەم غەدرە لە ترێ دەکەی؟!

## نەباتی

بەم جلە کوردییە سەوزەوە وەک پنجەگیا دەلەریتەوە
هەقی خۆتە گومان لە پیاوان بکەیت
کێ تا ئێستا گورگی دیوە نەباتی بێت؟!

## ڕامان

ناهەق نییە بەهاری خۆش دەوێ
بە ئێسقانی شان و ژێر ملییەوە دیارە
بەر لەوەی ببێتە مرۆڤ
پڕۆژەی درەخت بووە.

## گەنمڕەنگ

لە پەنا ئەسمەرییت خۆم دەشارمەوە
با بزانن بەرامبەر ئەو هەموو شمشێرە
گەنم چ هێزێکی هەیە.

## مۆمی بەر هەتاو

دوێنێ منت بینی چاوەکانت داخست
ئیتر دڵنیا بووم
ئەم ڕۆژگارە هەر تاریکیی لێ دەوەشێتەوە.

## ئەیوب

جوانیی؟
تۆ و شیعر هەمووتان برد و هیچتان نەهێشت
سەبر؟
من و ئەیوب هەموومان برد و هیچمان نەهێشت.

## مەحاڵ

سەخاوەتی جوانیت
لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە ڕەزیلە یەک ناگریتەوە
هەر لەوە دەکا، پەپوولەیەک دانیشتبێت بە دیار گوڵێکی ژاکاوەوە.

## بەڵێ

بە دەنکە شقارتەیەک
دارستانێک دەسووتێ
ئێستا ڕوونە کە گوتت نا چیت لە من کرد؟!

## خانمی هەسارەی من

ستایشت بکەم یان چی؟!
جوانیت لە هەسارەیەک زیندوو ڕایگرتووم
کە تەنیا بۆ مردن باشە.



## تۆ ئاگردانیت و خەڵکانی تر حیکایەتن

مادام هیچ شتێ لە مردن دەربازمان ناکا..
لانیکەم، با لە ژیاندا خۆشەویستی فریامان کەوێ.

پابلۆ نێرۆدا

## شوکولاتە

لەوە بەئازارتر نییە
لە تەمەنێک، کاتێک لە پووچیی ئەم جیهانە گەیشتووی
کەسێکی شیرین دێتە ناو ژیانتەوە
ڕێک وەک پارچە شوکولاتەیەک کە دەچێتە ناو ددانێکی کلۆرەوە.

## هەموو تۆن و تۆش کەس نیت

بۆ لەبیرکردنت، خەڵکی تازە دەناسم و
بە خەندەیەکەوە دەڵێم خۆشحاڵم
بەرەو ڕوخسارەکان ڕادەکەم
ڕادەکەم و تۆ نیت
لە پڕێکدا ئازاری ئەو چۆڵەکەیەم پێ دەگا
کە خۆی بە شووشەی پەنجەرەیەکدا دەکێشێت.

## ئاوڕ

حەسرەتی ناسینت پێش ئەوەی بگەم بەم تەمەنە
لە حەسرەتی ئەو پەیکەرە دەچێت
هەتاهەتایە ناتوانێ ئاوڕ لە دواوە بداتەوە.

## خەندە

بێهوودە تاقی دەکەمەوە
وەک ئەو پیرەمێردانەی ناوی دەرمان نازانن و
کە دەچنە دەرمانخانە پاکەتی حەبەکانیان پێیە
خەندەیەکی تۆم لەسەر ڕوخسارم داناوە و
هەر کەسێک ببینم تێی دەگەیەنم
لەو پێکەنینەم دەوێ.

## ڕەچەڵەک

لەو شەجەرەیەی بۆ بنەماڵە هەژارەکەمان دروست کراوە

لە لقی خێزانەکەم، لە گەڵای تەنیشتمدا ناوت نییە

بەڵام تۆ گرنگتریت ئازیزم

لەسەر ئەو درەختەدا

هێللانەیت هێللانە..

## تونێل

وەک پشـــیلەیەک، چـۆن لە ترســی دنیـا بێچووەکـانی لە
پەنایەکەوە دەباتە پەنایەکی تر
هەندێ وشەی تۆم بە ددان گرتبوو
بەیانیت باش، غەریبیت دەکەم، خۆشم دەوێی
هەندێ وشەی ڕەقیش کە دەیگوت چەکووشن
دەیگوت خەنجەرن
خوات لەگەڵ، ئێ باشە تەواو، نایەمەوە
چونکە دنیاش تەنها شتە باشەکان دەبات
لەگەڵ هەمــوو شکســتێکدا وشــەیەکی باشــی لە دەممــدا
ڕادەپسکاند و ددانێکم دەکەوت
ئێستا وەکو زیندانییەکی پیر، سبەینان شۆربای نیسک دەخۆم
و
شــەوانیش بە خەنــجەر و چەکووشــەکانتەوە توونێڵێــک لە
خەیاڵ هەڵدەکۆڵم و
لە بەردەمماڵتان سەر دەردێنم.

**لاپەڕە ٨٣**

بەدەم ڕۆیشتنەوە بیرت لێ دەکەمەوە
کە تووشی کەسێک دەبم بیناسم، پێش ئەوەی سڵاو بکا و
لە تۆ دامبڕێنێت
بۆ ساتێک چاو دادەخەم و پاشان دەگەڕێمەوە لات
ئەم چاوداخستنە هەمان ئیشی نووشتاندنەوەی لاپەڕەی کتێبی
هەیە
تا بزانیت گەیشتبوویتە کوێ.

**داگیرسان**

هێلانەیکمان بۆ خۆشەویستی دروست کرد
بە چیلکەی ئەو نەمامانەی هێشتا چیرۆکی بە"تابووت"بوونی درەختیان نەبیستووە
لە گوڵەگەنمی ئەو خەونانەی بە یوسفیش لێک نەدەدرانەوە پووشمان هێنا
ڕۆژگار هات و تۆ ڕۆیشتی
گیراوەیەکم گرتەوە
سێ شەو و سێ ڕۆژ، پیتەکانی خواحافیزیم لە فرمێسکدا خووساند
مشتێک خۆڵەمێشی ئەو ئاگرانەم تێ کرد کاتێک بۆ یەکتر دەسووتاین
یەکدوو شکستم ورد کرد و خێرا خێرا تێکم دا
خێرا وەکو ئەو هەنگاوانەی، جاران بۆ بینینی یەکتر هەمانبوو
دانە دانە سەری چیلکەکانی هێلانەکەم بەو گیراوەیە تەڕ کرد و
بە ڕیز وەکو دەنکەکانی شقارتە لە هەناوم دانا
ئێستا کە بە ڕێگادا دەڕۆم، جەستەم دەڵێی قاوغی شقارتەیە
هەر جارەی تۆم بیر دەکەوێتەوە، دادەگیرسێم.

## کچی سین

دەیگێـڕایەوە، هەمـوو چیـرۆکەکە لە شـەوێکی زسـتاندا بە
slawێک دەستی پێ کرد
بەهۆیەوە سەنتوور و ناوی سلێمانی خۆش دەویست
وەسیەتی کرد
مردیش لە گوندێکی قەزای سۆران بینێژن
گرنگی بە هیچ وشەیێک نەدەدا بە پیتی سین نەگوترابا
تا ئەو ڕۆژەی هەژاریی بە ئاگای هێنایەوە
کە کەسێک لە ژیانیدا خۆی خزاندۆتە ناو پیتی یەکەمەوە و
وەک تیرێک بەر دڵ کەوتبێت
لە ناوەڕاستیدا وەستاوە: Sی کردووە بە $.

## وەڵام

هەندێ پۆشاکم بە تایبەت بۆ بینینی تۆ کڕیبوو

هەروا بە تازەیی لەناو کەنتۆرەکەدا هەڵواسراون

ئێستا دەزانم

بۆچی عەلاگەی جل لە شێوەی نیشانەی پرسیار دروست

دەکرێ!

## کۆنە

من کەیفم بە چوونە لەنگە دێت
بەڵام بە دەگمەن دڵم دێ شتێک بکڕم
دەبینم جلەکان لەسەر عەرەبانەیەک بە هەڕەمەکی هەڵدراونەتەوە
چاکەتێک، کراسێک لە بنی بنەوە بە ئاستەم قۆڵێکی دیارە
و بە توندی ڕایدەکێشم
کە بیر دەکەمەوە ئێستا کەسێک هەیە لە شوێنێکی ئەم دنیایە
ڕۆحی دەگۆڕێتەوە ئەم قۆڵە باوەشێکی پێدا بکات، یان هیچ نەبێت سڵاوێک
ئیتر دایدەنێمەوە.

## هەنی

خۆی لێ دەبێتە ئەو کەشتییەی بارەکەی خنکانە و

منیش وا نیشان دەدەم چیرۆکی نووحم نەبیستووە

لە فێڵەکەی من نەگەیشتووە

بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا پێکەنینی ببینم

بە ئەنقەست هەموو گفتوگۆکانی لەگەڵدا دەدۆڕێنم.

## شاری خەونەکان

کە لە لای تۆ دەهاتمەوە

بە هەر ساتمەیەک لە ڕۆیشتندا

بە تونـد لەباوەشـکردنی هـاوڕێیەکم، خەنـدە و خۆشـیم لـێ بەردەبۆوە

کە تۆم نەما، وەکو ئەو منداڵەی دەمی کردۆتەوە و

لەسـەرخۆ پەرداخێـک ئـاو بـۆ میوانێـک دێنێـت، پـڕم لە فرمێسک و

دەترسم لە ڕاوەشاندنی دەستم لە تەوقەکردنێکیشدا بڕژێت.

## گیتار

بەو گیتارەی سەدان جار بە خەیاڵ لە بەردەم ماڵەکەی
ئێوەدا ژەندوومە
دەمویست لێنەگەڕێم پیر بیت
تۆش کەیفت بە دڵسافیم دەهات و پێدەکەنیت و ڕۆژ بە
ڕۆژ گەنجتر دەبوویەوە
لەگەڵ هەر غەدرێکی دنیا برینێک پەیدا دەبوو
ناچار ژێیەکی گیتارەکەم دەپچڕاند و دەمکردە تەلی تەقەڵ
و دەمدوورییەوە
برینێکی تر و ژێیەکی تر و دەمدوورییەوە
ئاگام لە خۆم و لە تۆش نەما
ئێستا پێچەوانەی یەکترین
تۆ وردەوردە هێڵ لە گەردنتدا پەیدابوو
منیش لەسەرمە ئەو هەموو سووتانە بگێڕمەوە، گێڕانەوە بە
زمانی ئەو هێتیمەی
لە قوتابخانەدا
لەبارەی خۆشەویستیی باوکەوە داوای ئینشای لێ دەکەن.

## ئەسمەر

من گەنمڕەنگم
کاتی خۆی کەیفم پێ دەهات کە دایکم یان خزمێکمان
دەیگوت
گەنمڕەنگەکان خوێنگەرم و خۆشەویستن
ئەو کاتەی تۆم نەما، زانیم گەنمڕەنگەکان
جوان نین لەبەر ئەوەی وەک سەموونێکی تازە
سبەینان لە پێخەفێکی گەرمەوە دێنە دەرەوە
نا
لەبەر ئەوەیە ئەم جیهانە باشیان دەهاڕێ.

## پرسیار

لە دایک بووم دڵم کون نەبوو

ئەدی بۆچی یەک لە دوای یەک ئازیزانم بەربوونەوە؟!



## قسەی کۆن لەبارەی غەریبیکردنەوە

ئەوسا، ژیان حەوزی مۆسیقا بوو.

سوهراب

## ئیره

هەمیشە ئیرەییم بەو پیرەمێردەی دراوسێمان بردووە
تووشی لەبیرچوونەوە بووە و
هەموو خەڵک بە مەلای گەڕەکیشەوە
بە ناوی ئەو ژنە بانگ دەکا
کە خۆشیدەویست.

## دانپێدانان

خۆشم دەوێی، وەکو ئەوەی سبەی بمرم

غەریبیت دەکەم، وەکو ئەوەی هەتاهەتایە بژیم

لەنێوان من و ژیاندا تۆ هەیت

بۆیە ئێستا لەگەڵ دنیا لەو ژن و مێردە دەچین

لەبەر خاتری منداڵەکەیان جیانابنەوە.

## پۆرترێت

کەشتی بووم و دەمویست لە ژیانێکەوە بتگوازمەوە ژیـانێکی
جوانتر
هەر کۆستێک و پارچەدارێکی لێ کردمەوە
ئێستا بە بەرچاومەوە ڕۆژانە سەدان خەونت دەمرن و
منیش بە زەحمەت بەشی یەک تابووت دەکەم.

## تین

وەکو هەنجیر

هەندێ قسەی شیرینی تۆم وشک کردۆتەوە

بۆ ئەو کاتانەی لێرە نیت.

**به سادەیی**

لەگەڵ ئەوەی باشیش نەژیام
تەمەنم بەخشییە تۆ
وەک ئەو دایکەی هێشتا تێرنەبووە و
نیوەی چێشتەکەی خۆی دەخاتە قاپی منداڵەکەیەوە.

## میمۆری

بۆ ئەوەی دووریبت لە یادەوەریمدا جێی بێتەوە
ناچار لە مێشکمدا هەرچی گۆرانیم دەزانی سڕیمەوە
ئێستا لە سەیرانی هاوڕێکانمدا سەر دەلەقێنم
بەشدار نابم لە گوتنەوەی گۆرانییەکان
تەنها لە کۆتاییەکاندا دەڵێم
ئامان.. ئاماااان.

## تێبینی

به تووڕەیی باسی خۆشەویستیت دەکرد
لەو دارتاشە دەچوویت
لانک دروست بکا و
بزماریشی بە لێو گرتبێ.

## درەنگکەوتن

دەبوو زووتر یەکتر بدۆزینەوە زووتر

زووتر لەو تەمەنەی یەکترمان ناسی

ئێستا تۆ لەوە فەقیرتری بتوانیت ئەو هەموو زیانە بژمێریت

ئێستا من لەوە سەنگینترم لەسەر شۆستە

لەبەرخۆمەوە قسە بکەم و

ئۆتۆمبێل بەهۆی تاسەیەکەوە لە تەنیشتم هێواش بکاتەوە و

بۆ لەحزەیەک تیایدا گوێم لە گۆرانییەک بێت و بمرم.

## مۆتیڤ

لەگەڵ تۆدا خەونی پەمەییم هەبوو

ئێستا بۆ وێنەکێشانم

ببینە

پارچەیەک ڕەژوو بەسە.

## بەرەبەیان

منیش وەک مام برایمی نانەوا

سبەینان زوو لە خەو هەڵدەستم

لە گەنمی ئەو یادەوەرییانەی ڕۆژگار هاڕیوونی

ئارد دەخەمە ناو سەتڵی ڕۆژمەوە و

فرمێسکی پرسەکان

فرمێسکی عاشقەکانی تێ دەکەم

دەیشێلم و دەیشێلم

دووریت هەویرێکە پێویست ناکا ئیسراحەت بکا

دەمودەست دەبێتە کارەسات.

## ئۆقرە

هەموو شتێک لەبارەی تۆوە دەزانم

دەزانم ماڵتان لە کوێیە، ناوی کەسوکارت، سەردانی خزمەکانت

تەنانەت دەشزانم ئەم وەختانە خەریکی چیت

کەچی تەنها بۆم هەیە لە دوورەوە

دڵم بە کۆکردنەوەی وردە هەواڵەکانت بدەمەوە

هەمان حەسرەتی ئەو منداڵە کەمئەندامەم هەیە

بەرامبەر بە جۆلانەیەک دانیشتبێ.

## خوێ

ئەم ژیانە خۆی بریندارە

هەق نەبوو

تۆش بێیت و ڕۆڵی خوێ بگێڕیت.

## چەندین سەرەتا و یەک کۆتایی

سەرەتای خۆشەویستی خەمەکان ساوان
بە چەند دڵۆپێک لە شیری ئای ئای مەمکی گۆرانییەک ژێر
دەبنەوە
وردە وردە خەمەکان گەورە دەبن و متمانەت بە هاواریش
نامێنێت
دوو جار لەسەر یەک بە توندی چاوت دەنووقێنی و
دەڵێیتە فرمێسک ڕێگاکە ئەمینە بڕژێ
هەر خۆت دەزانی چەند چیرۆکت دۆڕاندووە تا تێگەیشتی
ئەوانەی بەتەمای هاتنەوە نەبوون، هەر ئەوان بوون بۆ
یەکەمجار
ڕستەی (هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم)ـیان داهێنا.

## شرووب

به دەنگە خۆشەکەت گوتت دەڕۆم
لەو کچە جوانانە دەچوویت لە دەرمانخانەدا
بە خەندەیەکی شیرینەوە
شرووبێکی تاڵت دەدەنێ.

## تریفه

دەزانی چۆن خۆشم دەوێی؟!
وەک باپیرەم
قەت بە داپیرەمی نەگوت تۆ مانگی منیت
کەچی هەموو شەوە تاریکەکانی لەگەڵ بەش کرد.

## تووڕەبوون

هێندە غەریبیت دەکەم
گەیشتوومەتە هەمان قۆناغی ڕوخساری سوورهەڵگەڕاوی
داپیرەم
کاتێک لە ڕەسمێکی ڕەشوسپی تووڕە دەبوو و دەیگوت
کوا ئەم ئازیزانە بۆ کوێ چوون؟!

## ئەو دڵەی لە جەستەمدا میوان بوو

سەرەتا غەریبی ئەو کەسە دەکەیت کە خۆشت دەویست
وەکو ئینکاری لەو کەسەی جاران خۆتت هەڵدەکێشا کە
باشی دەناسیت، بیانوو دێنیتەوە بۆ باش هەڵنەسەنگاندن
یەکدوو سوعبەتی پاکی نێوانتان گەورە دەکەیت و بە
ئیهانەی لێک دەدەیتەوە
دەتەوێ پێکەنینت بێ بەو شتانەی هەڵتگرتوون: عەترێکی
بەسەرچوو، دڵت نەهاتووە بەکاری بێنیت. قونکە جگەرەی
بە سووراو و چەند تاڵەموویێک و پەڕۆیەکی گیرفانی
چاکەت و پەپوولەیەکی بەستەزمانی وشککراوە لە لاپەڕەی
کتێبێکدا
کەمێک بەئاگادێیەوە و دڵت خۆشە گوایە سەرلەنوێ
شتەکان دەچنەوە شوێنی خۆیان

بەرد دەبێتەوە بە بەرد و چیتر بە دڵی ئەوی ناچوێتیت

کە دەخەوێت، ڕوو لە دیوار ناکەیت تا سەدان جار

لەبەرخۆتەوە یەکتر ببینی ئەو ڕۆژە بگێڕیتەوە

وەک مرۆڤێکی ئاسایی نانی بەیانیت بۆ دەخورێ و

وەرزەکان دەچنەوە شوێنی خۆیان و ڕۆژانە تەماشای

کەشوهەوای شارەکەی ئەو ناکەیت

دواتر... ئای دواتر لەحزەیەک دێت کە پێت وابوو لە

زەمەنی تۆدا نەمابوو

وەکو جاران دڵت بە خۆت دەسووتێ، دەبینی تەنیایت و

لەسەر جامی چێشتخانەیەک نووسراوە: "شوێنی تایبەت بە

خێزانمان هەیە"

ئیتر لەگەڵ غەریبیکردنی ئەودا

زیاتر غەریبی خۆت دەکەیت

خۆتی ئەو سەردەمەی خۆشت دەویست.

## وەفا

لە جەستەدا
موو لە هەمووان بە وەفاترە
وەک قەرەبوو بۆ هەر ڕۆژێکی ڕەش
تاڵێکی لێ سپی دەبێ.

## دەفر

دنیا بۆ وا بە تۆی گرتووە؟!
چییە کەسی تری نییە
بارانی لێ ببا و لمی بۆ جێ بێڵێ
غەمزەی لێ ببا و چاوی بۆ جێ بێڵێ
دوعای لێ ببا و قەبری بۆ جێ بێڵێ
چییە، کەسی تری نییە دنیا؟!

**تەنیا مانەوە**

دەرگام لە خۆم داخستووە

نەک لە ترسی پەرتبوونی تەنیاییم

بەڵکو بۆ ئەوەی واقیع نەیەتە ژوورەوە.

## پەنا

هەر ڕۆژەی لە پەنا شتێک خۆم دەشارمەوە

لە پەنا درەختێک، کە تەنیا بۆی هەیە ببێتە گۆچان

لە پەنا زانینێک، لە چاوقایمیی خۆمەوە پێی ناڵێم سەراب

لە پەنا پەنجەرەیەک، لە ڕاستیدا کونێکە و بۆم پینە نەکراوە

لە پەنا ژنێک، هێندەی هەڵوەشانەوەی کوبەیەک لە دەستیدا

گرنگی بە شکانی دڵم نادا

لە پەنا مێژوویەک، کە ڕاستییەکانی بە خزمایەتییەکی دووریش

ناگەنەوە بە درۆکانی ناو کتێبان.

## دوارۆژ

زۆر لە دار دەچیت، چەند کۆنتر بیت باشتر ئاگر دەکەیتەوە

کەی شەراب زانی چ غەدرێکی لە ترێ کردووە ئینجا

دەمناسیت

ئێستا لەوە بەتەمەنترم دۆستم هەبێ

ئێستا لەوە بەتەمەنتری دۆستت هەبێ

وەک ژن و پیاوێکی پیر بەیەک دەگەین

بە دیار شۆربای مەراقەوە لە غەدری دنیا دەڕوانین و

هەرایەکی خۆش دەنێینەوە

تۆ پیرەژنێکی نوورانی و بۆنی شلەی قەیسی بەرەبەیانی

جەژنت گرتووە

منیش پیرەمێردێکی عیناد

تۆ خوات دەبێ و منیش تۆ..

**بورجی گیسک**

کە لە دایک بووم خێریان کردبوو

ئەو گیسکەی سەریان بڕی

بورجەکەی خۆم بوو.



## نەبووی بەوەی دەتویست

هەرچەندە سەراپا گوڵی، ئەمما گوڵی هێرۆ

نالی

## دەسکەوت

لە ڕستەی
هەتا ئاخیر لەگەڵت دەبم
تەنیا ئاخ مایەوە.

## شایەتی

ئەمڕۆ گوتت پیر بووم
ئەمشەو هەموو درەختەکانی ئەم شارە
خەون بەوەوە دەبینن ببنە گۆچان.

## یاداشت

خەریکی جەردم

وردەوردە مووەکانم سپی دەبن، باڵا و کێشم لەدەست دەدەم

یادەوەری هەر کاتێک بیەوێ دەمباتەوە سەر شکستێک

جۆرەکانی خواردنەوەی مەراق زیاد دەبن و ژمارەی خواردنە ڕێگەپێدراوەکان کەمتر

ئاراستەی گلەییم لە نیشتیمانەوە گۆڕیوە بۆ خیانەتی پەنکریاس و ئەژنۆیەکم

سجلی جەردی تەمەنم هەر لە کەمی دەدا

تەنها خۆشەویستیم بۆ تۆ زیاد و زیاد و زیاتر دەبێ.

## غەریب

کە دەزانم لەم شارە نیت
وەک ئەو منداڵانەی پێڵاو بۆیاخ دەکەن
سەر بۆ بینینی ڕوخساری کەس هەڵنابڕم.

## نادادی

له دڵی مندایه و

له ماڵی کەسێکی تر

وای چ ئیهانەیەکە بۆ درەخت

کە چۆڵەکەیەک لەسەر تەلی عامود دەنیشێتەوە.

## دیانا

من هەمیشە

تۆ دەخەمە ناو کەوانەوە

نەکا سەرمات بێت.

## ونکردن

دەمێکە لە کەسم نەبیستووە

وەکو جاران پارەیەک لە شۆستەی بازاڕدا بدۆزێتەوە

چونکە تەنیا تەماشای یەکتر دەکەین

هەر یەکە و بە شوێن ڕوخساری ئازیزێکدا دەگەڕێ

کە ونی کردووە.

## من دیت جارا عەولی

بە ناردنەوەی ئەو گۆرانییەی یەکەمین جار من ناردبووم
بەجێی هێشتم
وەک ئەو کۆترەی بیگرن و
هەر بەو چیلکانەی کۆی کردبۆوە بۆ هێلانە
بیبرژێنن.

## دیاری

که ڕۆیشت

هەموو ڕەنگەکانی لەگەڵ خۆی برد

تەنها سپی بۆ پرچ و

ڕەشی بۆ ژێر چاوم بەجێ هێشت.

## پەند

کە گوتیان گەورە و کامڵیت

دڵخۆش مەبە

ئەمە واتا هەر کەسێکت لەدەست چووە

پارچەیەک لەو منداڵەی ناختی لەگەڵ خۆیدا بردووە.

## سڕینەوە

کەسێکی هەبوو

ئێستاش بە ئومێدی ڕامالینی ئەو سالانەی بێ ئەو ژیا

لە هەر شوێنێک گسکێ ببینێ دەیکڕێت.

## مەغریب

لەناو ئەم هاتوهاوارە

چەند ئەستەمە بۆ ئەوانەی

بە بێدەنگی لە ناوەڕاستی گۆرانییەک دانیشتوون و

چاوەڕێی نامەی ئازیزێک دەکەن.

## دەنگ

نامە نا

متمانەم بە دەنگت هەیە

چونکە مۆسیقا ناتوانێ درۆ بکا.

## به كورتی

به کورتی غەریبیت دەکەم
ئەوانەی پاڵەوانی چیرۆکێکی خەمبار بوون دەزانن
کارەساتی گەورە پێویستی بە گێڕانەوەی درێژ نییە.

## دڵدانەوە

بۆ هاتنەوە ئومێدت بە تاریکی هەبێت
ئێواران نامەی ئاشتبوونەوە بۆ ئازیزانت بنێرە
ئینسان لە شەودا لەو بزمارەی دیوار دەچێت
بە دیار پارچە پەتێکەوە نووشتاوەتەوە و
دوای مردن وێنەی خاوەنماڵەکەی لێ کرابێتەوە.

## ئەکتەر

قەت قسە بەو کەسانە نابڕم
وەکو خۆم بەگەرموگوڕی دەدوێن
هەموو ئەوانەی کەوتوونەتە ناو خۆشەویستییەوە
دەیانەوێ نمایشی هەستانەوە بکەن.

## ئەمەک

سڵاو ئەی شەو
هاتینەوە
هەقی خۆشتە دەرگامان لێ نەکەیتەوە
ئێمە ئەو ناسیاوانەی تۆین
کە هەمیشە بۆ باشتربوون
ئومێدمان بە سبەینان هەبووە و
بە کۆمەڵێک شکست و یادەوەریش لای تۆ کەوتووین.

## دەڵێن پیر بووین

ئەوسا وەک دوو گوڵەپەمۆ بۆ برینی یەکتر
لێ نەگەڕان بەیەکەوە بین
گوتیان بچووکن
ئێستا وەک دوو هەور بۆ تەڕکردنی یەکتر
نایەڵن بەیەکەوە بین
دەڵێن گەورەن
بە هۆی بۆیەکترنەبوونی من و تۆیە
پیرەکان حەزیان لە دەنگی بارانە و
ساواکانیش پەمۆ دەخەنە گوێیانەوە.

## دووان

لەم سەردەمە ناخۆشەشدا قسەی جوانم بۆ هەڵگرتووی
وەک ئەو کرێکارە پیرەی هەموو گیانی تەپوتۆزە و
چوار نانی گەرم و خاوێنی لەسەر دەستە.

## شەوچەرە

به پێچەوانەی چیرۆکەکانی داپیرەم
کە تیایدا زاڵمەکان دەیاندۆڕاند
من مردم و جوانییت بردیەوە.

## سێبەر

ژن کە شێوەی کەوتەوە سەر ڕوخساری دایکی
دەزانێت گەورە بووە
خەریکە لە دایکت دەچیت
ئاخر ناکرێ کە ڕۆژ نەما
چاکەی سێبەری درەختمان لەبیر بچێت.

## دیاری نادیار

لە ناسنامەدا ناوت لەسەر ناوم نییە

کەس نازانێ یەک خێزانین

لەنێوانماندا

لەجیاتی منداڵ

دوو گۆرانی هەیە.

## خەتا

کە تۆ نایەیت

خۆم بیانووت بۆ دەدۆزمەوە

دەڵێم

دیارە من باش چاوەڕێم نەکردووی.

## جیابوونەوە

چاوی کچەکەی من لە چاوی ئەو دەچێت
چاوی کوڕەکەی ئەو لە چاوی من دەچێت
ئێستا هەردووکمان
هەر یەکە و لە ماڵەکەی خۆیدا
لە ڕێی ڕوخساری منداڵەکانمانەوە پێکەوە دەژین.

## کانی

بۆ لەبیرکردنی خۆشەویستەکەی
خێزانی پێکهێنا و منداڵیشی بوو
ئێستا کچەکەی ناوی کانییە
بەڵام خۆی
خۆی گۆزەیەکی شکاوە.

## تاتۆ

به تاتۆی کۆتره بچووکه‌کانی سه‌ر مه‌چه‌کی
به ئازادم زانی
که باسی ژیانی خۆی بۆ ده‌کردم
تێگه‌یشتم هه‌مان وێنه‌ی سه‌ر دیواری زیندانه‌کانه.

## ڕاوچی

گوتی کە پەیوەندیمان هەبوو

کەس هێندەی ئەو بەڕێزەوە نەیدەدواندم

دوای هاوسەرگیری زانیم

بۆچی ڕاوچی بەبێ خشپە لە باڵندە نزیک دەبێتەوە.

**مێرد**

به ناوی سێبەری درەختەوە هاوسەرگیری کرد
ئێستا ئەو ژنە
لەناو چوار دیواردا
چێشت لێدەنێ بۆ دیواری پێنجەم.

## نێرینه

بەتەمابووی بە گوڵێکەوە لە دەرگات بدات؟!

مێژووی نێرینەیی ڕوونە

پیاو هەمیشە ئەو تۆپەیە

شووشەی پەنجەرە دەشکێنێت.



## پایزی زەعیم

# لە سێبەری ڕۆمانی پایزی پەترێرکی مارکیزەوە

هەر کەسێک هەستی کرد ئەم تێکستە مەبەستی لەوە،
ئەوا پێش هەمووان پێشکەشە بەو.

کەس بیری نایە لە کەیەوە بۆتە زەعیم
ئەوەی زانراوە کەسێکی ئاسایی نییە
دەتوانێ کانزاکانی ژێر زەوی بخوات و
پێدەشت بە دارستانەوە بجووێت
ڕووبار هەڵقوڕێتێ و ئاسمان بخاتە باخەڵییەوە
مێژوونووسەکانی دەڵێن توانای زەعیم لە ئەفسانەکانیش
بەدەرە
دەتوانێت بە فووێک چەندین وڵات بڕووخێنێ
بە هێمایەک مێژوو دروست بکا
کارەبا دەخواتەوە و نالەرزێ
نەوت دەخاتە گیرفانییەوە و نارژێ!

زەعیم هەمیشە گلەیی لەوە دەکا
وڵاتێکیان داوەتێ لە هاویندا پلەی گەرمای دەگاتە پەنجا و
قسوور
لە زستاندا فرمێسک لە جادەکانیدا جۆگەلە دەبەستێ

پایزانیش لە جیاتی گەڵای درەخت
ئومێد لە بەژنی مرۆڤەکانیدا هەڵدەوەرێ
لە دنیا هێندە نەگبەت بوو
تەنیا دەزانێ فەرمان دەربکا
دایکی گوتەنی بریا دارتاش بوایە یان معاون توبی
یان هیچ نەبێ هونەرمەند
بەڵام تەنیا دەزانێ فەرمان دەربکا
هەموو سامانەکەی وڵاتێک و فتقێکە
کە دەنگی ژانی زۆر لە فیکەی کتریی دەچێ!

دایکی لەگەڵ ئەوەی هەموو شتێکی وڵاتەکەی بە ناوە
بە گسک ڕاوی خزمەتکارەکان دەنێ
گوایە دەستبڵاون و
شەکری زۆریان لە چایەکەی قونسولی تورکی کردبوو
هیچ عەرەبانەیەکی سەوزەفرۆش نەیدەوێرا نزیکی کۆشک ببێتەوە
ئامادەبوو شینومۆر ببێتەوە لەسەر نرخی دەسکێک کەوەر
بە بۆیەی دەرگا و پەنجەرە چۆلەکە و زیقاوی ڕەنگ دەکرد و

به ناوی بولبول و کەنارییەوە بە وەزیرەکانی دەفرۆشتەوە
وێـڕای پاڕانەوەمـان لەبەر چـاوی میوانەکـان و لە تەنیشـت
هۆڵی کۆبوونەوە
دەستی لە عادەتی سووتاندنی قشپل هەڵنەدەگرت
تا لە دانیشتنەکاندا مێشوولە نزیکی کوڕەکەی نەبێتەوە
ڕۆژێکیان ئابڕووی بردین
کـاتێ زەعـیم بە بەرگـی سـەربازی و بە تەواوی میـدالیا
ئاڵتوونییەکانی سەر سنگی
لەتەک سـەرۆکی میوانـدا سـەرقاڵی پشـکنینی پاسـەوانی
شەرەف بوو
خانم بە تەنگەتـاو سـندوقێک شووشـەی بەتـاڵی بیبسـی دایە
دەستی زەعیم و گوتی
مادام هەر دەچیتە دەرەوە
لەگەڵ دەستی خۆت ئەم شووشانە بدەرەوە دوکـانی سـەری
فەرعەکە
بەوەندەش نەوەستا و هاواری کرد
گەر دەمزانی کوڕەکەم دەبێتە شت و
ئەو هەموو سەرە سۆدە و مێخ و زنجیرە دەبەستێ
دەمناردە مەتکەب.

زەعیم ئەو ڕۆژنامەیە دەخوێنێتەوە
کە خۆی بۆ خۆی دەریدەکا
پێی سەیرە چۆن نووسەرەکان
لەو نەخێرە گەیشتبوون کە بیری چووبوو بیڵێ
یان ئەو زۆڵانە چۆن زانییان مەبەستی لەو نەخێرە بەڵێ بوو؟!

زەعیم لە یاری شەترەنجیشدا قەڵای خۆش ناوێ
چونکە ڕاستەڕێ دەڕوا
حەزی لە بازە خوارەکانی فیلە
بۆیە قەڵا لە پاشا دوورە و فیل نزیک.

لە منداڵییەوە دوژمنی بیرکارییە
تێناگا چۆن هەموو ژمارەکان یەکسان نین بە یەک
وەک چۆن میللەتێک یەکسانە بە ئەو؟!

لە مێردمنداڵییەوە ڕقی لە فیزیایە
خۆی گوتەنی زەعیم پێویستە دوو تەمەنی هەبێ
یەکێک بۆ پارە کۆکردنەوە و
یەکێک بۆ خەرجکردنی.

لە ئەزەلەوە حەزی لە کیمیایە
سەری مامۆستایەک بگوازەوە بۆ لەشی جاشێک
سەری تاوانبارێک بگوازەوە لەشی پارێزەرێک
کیمیا ڕێگەی پێ دەدا
چۆنی بوێت سەرەکان بگوازیتەوە.

زەعیم هەموو شتێکی لە پێناو ئێمەیە ئێمەی بێوەفا
کـــارگەی جـــگەرەی دانـــاوە بـــۆ ئەوەی بە دیـــار
دەسکەوتەکانەوە بە بای دەین
کارگەی کلێنسی داناوە فرمێسکی خۆشیی پێ بسڕین
کارگەی دەرمانی داناوە و هێند پەرۆشە
لە گەچیش حەب دروست دەکا
باخچەی کردۆتەوە تا بە پارەیەکی کەم
منداڵەکانمان کەروێشک ببینن
کەچی لە پاشملە دەچرپێنین
لای ئەو تەنیا پارە ڕیوایەی سەحیحە
لە ڕاستیدا هێند نەدارە
ئاو چییە ئاو
ئاو دەخاتە بتڵەوە و دەیفرۆشێ!

دروستکەری وەرزەکانە
بە قسەکانی بەهار دێنێ
بە کردەوەکانیشی پایز.

تاکە کەسە بتوانێت
بە گوفتاری مانا بسڕێتەوە
بە کرداری جووڵە لە جووڵە بخات.

زەعیم ڕاستی لە دواوەی ناڕوا
ڕاستی بۆتە فەرشی سوور و بەسەریدا گوزەر دەکا
خەڵاتی ئازایەتی دەداتە ئەو کەسانەی شتی دەگمەنیان هەیە
چاویان دەبینێ و سەریان کوێرە
پیت دەناسنەوە و ڕستە نازانن
دەنگیان نایە و دەنگ دەدەن
زەعیمی موفەدا
لە ڕۆژی مافی ژناندا پرێمز دابەش دەکا
لە ساڵڕۆژی منداڵاندا باس لەو موعجیزەیە دەکا
کە چۆن بەر لەوەی پێ بگرن فێری کڕنووش بوون؟!

ئەو لاوانەی خۆش دەوێ تەسبیحی قەزوانیان پێیە و
بۆینباخ نەبێ هەموو شتێکیان دەچێتەوە سەر باپیران
ئەو ژنانەی بە دڵە
لە ناخەوە پیاون
هەر ئەوەیە
بە شیلە ڕیشیان دەکەن و
بە داو سمێڵیان هەڵدەگرن.

زەعیم گوناحە
تا ئێستا کەس خەبەرێکی ڕاستی پێ نەداوە
ژەمێکی بە تێری نەخواردووە
پاسەوانەکانی بە پاساوی ژەهر نیوەی چێشتەکەی دەخۆن
لە ترسی ئەوان هەنگوین لە کونی دیوار دەشارێتەوە
ناچارە بە دزی دکتۆرەکانەوە ساوار بە گۆشت بخوا
ژیانی تایبەتیشی نەماوە
ناتوانێت بکۆکێت، بپژمێ، دەیخەنە سەر لاپەڕەی یەکەمی
ڕۆژنامەکان و
تیشکی دەخەنە سەر و لە ژێر ڕۆشناییدا وتار دەنووسن
بێبەختییەکەی گەیشتە ئەوەی تووتی ماڵەکەی ڕایکرد و

قسه نهێنییه‌کانی شه‌و و ترسه‌کانی له کوده‌تا و
فیکه‌ی کترییه‌که‌ی برده سه‌ر جاده و ناو خه‌ڵک
به ده‌نگه زیقنه‌که‌شی لاسایی قاقای ژنه خزمه‌تکاره‌کان و
ئامۆژگارییه‌کانی دایکی ده‌کرده‌وه
- ڕۆڵه هه‌ندێ پاره له پشتییه‌ک بشاره‌وه.. گیانی دایه له‌و کورسییه بتهێننه خواره‌وه هیچ ئیشێک نازانی. ئاخر تۆ قه‌سابیش نه‌بووی، یان خۆزگه ده‌نگت خۆش بایه. ئێستا شوکر وه‌زیره‌کان مریشکم به ناوی چینوماچینه‌وه لێ ده‌کرن، له‌و کورسییه بتهێننه خواره‌وه ئه‌وه‌ش نامێنێ. که‌سی دایه هه‌ردووکمان پیر بووین، بتهێننه خواره‌وه ده‌بێ ته‌نیا سه‌یری ئه‌لبوومی وێنه‌کانت بکه‌یت، منیش حه‌وسه‌ڵه‌م نه‌ماوه چیتر سه‌ڵکه پیاز و دۆشاوی ته‌ماته و ژێرپیاڵه خوێ له دراوسێکان قه‌رز که‌م.

مه‌یبینن له وێنه‌کاندا پێده‌که‌نێت، زه‌عیم گوناحه
گندۆره‌یه‌کی به قه‌ڵه‌مبڕ پاک نه‌کرد و ترسی ژه‌هری نه‌بێ
له نیوه‌شه‌واندا سه‌لاجه‌ی بۆ قومێ ئاو نه‌کرده‌وه ترسی
ته‌قینه‌وه‌ی نه‌بێ
بۆینباخێکی نه‌به‌ستا په‌تی سێداره‌ی بیر نه‌هێنێته‌وه
ژنێکی نه‌بوو پشتی بشوات و ئێواران شۆربای نیسکێنه‌ی بۆ لێنێت

بلێ پیاوەکە خۆشم دەوێت و پەتاتەشمان نەماوە
کەسێکی نەبینی هێندەی سڵ لە قسەکردن دەکاتەوە
نیو هێندە لە پیربوون بترسێ
نەک وەهمی سەرکەوتن، کەس نەبوو تامی دۆڕاندنێکیشی
بداتێ
دۆڕاندنی دەستەدۆمینەیەک
کەس نەبوو لە بەرامبەریدا پێڕێکی پۆلیسییش دروستکا و
دابەزێ
لە تاوڵەدا قاپووتێکی بۆ بکا
بە حەسرەت بوو سەربۆیاخکراوێک
داشێکی دامەی بە خۆڕایی بداتێ و لەبریدا داوای شتێک
نەکا
ئاییی
لە یاریشدا کەس ڕاستیی پێ ڕەوا نەبینی!

زەعیم، گەورەترین گرفتی ئەوەیە
ئەم وڵاتەی بەسەریەکەوە بۆ نافرۆشرێت
هەر شاندێک دەهات ستایشی ئاو و هەواکەی دەکرد و
وێنەی بەنداوی دوکانی لەسەر دە دیناریی جاران و وێنەی

گەلی عەلی بەگی لەسەر پێنج هەزاری نیشان دەدان
دەیگوت گوند گوند و شار بە شار نا، بەڵکو بە جوملە!
پارچەیەک لە پەنیری پێستەی چیای سەکران و ژاژی و
نڤیشکی چۆمانی دەدایە میوانەکان، بە خۆهەڵکێشانەوە
دەیگوت تامی بکەن و ویژدانتان هەبێت: ئەمە لە کوێ و
بەقەرە زاحیکە لە کوێ؟!

لەگەڵ ئەوەی پێیان گوتین چەندە منداڵێکی ساوا پێویستی
بە فێربوونی ژەنینی شمشاڵە
ئەو نیوئەوەندە پێویستی بە زانینی ڕاستییە
کەچی ناچاربووین بۆ قەرزی سەربۆیاخکراوەکان بچینە
لای زەعیم
ڕێگەیان دا سێ کەسمان بچینە ژوورەوە
یەکە و جزمەیەکی سەقفتێکردنیان لە پێ کردین، لە
قوڕاوی ڕەنگاوڕەنگ بە بۆیەی دەرگا و پەنجەرە،
سەربازێک کە هەر پێدەکەنی بە پێشمان کەوت، لە
حەوشەکەدا مریشکی نیوە ڕەنگکراومان بینی دەنووکیان لە
وەهمی گوڵەبەڕۆژەی ئەو فەرشانە دەدا، بۆ وشکبوونەوە بە
پەیکەرەکانی زەعیمدا هەڵخرابوون.

پیرێژنێکمان بینی مانگای دەدۆشی و پرتەوبۆڵەی بوو، سەربازەکە گوتی: ئەمە دایکی وەتەنە. تێگەیشتین پرتەوبۆڵەکانی بۆ ئێمەیە: چیتان لە کوڕەکەم دەوێ؟! هەیەتی و نییەتی کورسییەک و فتقێک، نەک خۆی، ئەم مانگایەش لە ماڵەکەیدا هیچ نییە بیخوات.. قازانی شیرەکەی لار کردەوە نیوەی بەتاڵ بوو. ئەوە نییە کاغەز کاوێژ دەکا؟! خۆزگە کاغەزی ڕەنگداریش بوایە، نەخێر ڕۆڵە، لەو کاغەزە جووتپەڕە خەتدارە خورشیدیانەیە کە ئەو میللەتە چاوبرسییە شەکوای لێ دەنووسن!

بینیمان زەعیم بە تەنیا لەسەر مێزێکی نانخواردنی نۆزدە کەسی دانیشتبوو، بە چاکەتێکی سپی کەتانەوە چاویلکەی خوێندەنەوەی هێنابووە سەری لووتی، زۆر پیرتر بوو لەو وێنانەی بەیانیان لە ڕۆژنامەکانیدا سفتاحی مەراقمان پێ دەکرد. جەستەی بۆنی گیای زەردباوی سەر ئەو سەتڵە ماستانەی دەدا لەبەر هەتاوی چاوەڕوانیدا ترشابن.. ڕەنگی دەستەکانی کەسکێکی ڕەشباو بوو، لەبری موو قەوزەی تەنکاو و پونگە و کوزەڵەی تەنیشت جۆگەلەی گرتبوو کە لە مەنجەڵی شەونخوونیدا بە ئاگری کزی دەسەڵات کوڵابوون، لووتی گرنج گرنج بوو لە شێوەی بەردەپێی حەمام کە چەندین سەدە لە ژێر ڕەحمەتی کەفاو بووبێ،

چاوەکانی لە چاوی ئەو پیرەمێردانە دەچوو لە بەردەمی مزگەوتەکاندا مووس و سیواک و لاستیکی بێجامە دەفرۆشن و هەموو گفتوگۆکان بەرەو ئاقاری ڕۆژانی ڕابردوو دەبەنەوە. هێندە بێکەس و ماندوو دەهاتە بەرچاو، پێمان سەیر بوو ئەو هەموو ساڵە ڕقمان لەو خێر و عەشق لەخۆنەدیوە بۆتەوە!

بە هێمنیی ئەو کەسانەی لە هەژاری ڕاهاتوون و بە منگەی حووتێکی بەساڵاچوو فەرمووی قسەکردنی لێ کردین

بۆمان ڕوون کردەوە کە سەربۆیاخکراوەکانی حاشییەی هیچ نەماوە لێمانی نەبەن

چونکە بەڕێزیشی یەکەکانی پێوان و پرۆسەی لۆگاریتم و بڕگە قوچەکییەکان و هاوکێشەی لێکەوتە و خشتەی لێکدانی نەدەزانی، ناچاربووین لەسەر شێوەی داپیرەمان ژمارەکانی بۆ ڕوون کەینەوە

گوتمان سەربۆیاخکراوەکان سێ بیست و دە، کە دەکاتە حەفتا جار زیاتر لە بەرهەمی ساڵانەی باخەکانی بۆکان میوەیان بە قەرز بردووە!

بە هێمنی لەبەرخۆیەوە چرپاندی: ئاخ.. ئاخ

- بەڵێ زەعیم: پیاوەکانت بە ڕووبەری دووجاری هاتوچۆی نێوان ماردین و مەخموور، قوماشی کشمیری تورکی و کرێشەی هیندی و کریپ و مۆزلین و جەرسە و هینم دیارە

و سەتەن و تیترۆن و چاوماریان بۆ ژنەکانیان بردووە.
گوتی: ئاخ.. ئاخ
- بەڵێ قوربان بەقەد قورسایی قەڵاتی هەولێر
قەڵەم و بۆینباخ و نەعلی تـوبیی و جانتـای دبلۆماسـی و موعەتەری ژێربال و مقەوییات و عەینەکی شەمسی و کەڤەر و مەقلی و شیشی کەباب و پەرداخی سەفەرییان بردووە.
گوتی: ئاخ.. ئاخ
- بەڵـێ چـاوەکەم بەقەد قـووڵایی شـەش سـەد و حەفتـا و یەک مەسبەحی سی و پێنج مەتری
وێسکی دەمپل و شـیفازی سـالوت و بلـو لێیبـل و ئۆلپـار و بەلانتاینیان بە خۆڕایی خواردۆتەوە
وەک داشکاندنێکیش بۆ جەنابتـان باسـی مەزەکـان نـاکەین کە تەنیا بابەغەنوجەکەی بەقەد ڕووبەری یاریگـای سـانتیاگۆ برنابیۆ دەبێ
گوتی: ئاخ.. ئاخ
- بەڵێ گەورەم بەقەد درێژایی تەلی عەموودەکانی کارەبـای نێوان پێنجوێن و غازی عەنتاب، تەسبیحی عـاج و کرمـان و کەهرەب و سـەندەلووس و قەزوانـی لاسـوورەیان لە پەنـجە ئالاندووە
گوتی: ئاخ.. ئاخ

- بەڵێ عالیولمەقام سەربۆیاخکراوەکانت بە تەنکەری حەفتا و دوو هەزار لیتری

فرمێسکی دایکی شەهیدان و خوێنی بانکی خوێنەکان و ئارەقەی کرێکاران و خووناوی نێوچەوانی نەخۆشەکان و نەوتی ناو چراکان و مەرەکەبی شاعیران و بارانی زستان و لیکی ساوا دەم بە مەمەکان و شەونمی بەیانیانی سەر گەڵاکان و هەڵمی نان و هەڵمی ئاهی جووتیاران و تەڕایی گونییەی سەر میوەی عارەبانەکان و تەڕیی تەڕەشوحی دیواری مەکتەبەکان و هەڵمی هەناسەی منداڵە کلێنسفرۆشەکانی چوارڕیانەکان و هەڵمی فووی دەستگەرمکردنەوەی پیرەمێردە قەڵەمبڕ و دۆخینفرۆشەکانی بەر مزگەوتەکان ئاودیو دەکەن

گوتی: ئاخ.. ئاخ

- ئەی چۆن جەناب بەقەد خەرمانی هەموو گەنمی دەشتی قەراج

بۆیاخی ڕەش و ڕەشی بۆز و قەترانی و باینجانی و قاوەیی و خورماییان بۆ سەر و بەر و سمێڵیان بردووە

لە وەرگاکان ئیرەیی بە مەسبەحەکانیان دەبەن، داندۆک و کەشک و تەماتە پڵیشاوەکانی سەر سینی سەربانەکانمان

ئیره‌یی به ساوناکانیان ده‌به‌ن
شیرینییان له ڕوخساره‌کاندا برد و
له تفت و ترشیدا خاڵی ڕوومه‌تی یاره‌کانمان لێ بۆته ده‌نکه سماق
گوتی: ئاخ.. ئاخ
- به‌ڵێ حه‌یاتم به کرێتی گه‌وره گه‌وره وێڕای کانی و سه‌وزایی، گرد و گردۆلکه و هه‌ورازی گونده‌کانیان بۆ مه‌زره‌عه‌کانیان گواستۆته‌وه. به ده‌ڕاسه‌ی گه‌وره گه‌وره سڵاوی به‌یانیان و سه‌ره‌خه‌وی دوای نیوڕۆ و سه‌رخۆشیی شه‌وانی شاره‌کانیان دروێنه کردووه.
ده‌خیله‌ی ساواکانیان کردۆته ئینجانه‌ی په‌نجه‌ره‌کانیان
مانگیان وه‌ک ده‌رهه‌مێکی زیو کردۆته زینه‌ی ماڵ
هه‌تاویان وه‌ک لیره‌یه‌کی ئاڵتوون خستۆته قاسه‌وه
نیوه‌ی خه‌ڵکیان فرۆشت و به پاره‌که‌ی ده‌یانه‌وێت نیوه‌که‌ی تر بکڕن
قه‌ڵه‌می مه‌کته‌بی منداڵه‌کانیان بردین، مێژووی خۆیان به ئاوه‌ژوویی بنووسنه‌وه
شیری گوانی مه‌ڕ و ماڵات و مه‌مکی ژنه‌کانیان بردین
وه‌چه‌ی خۆیان پێ گه‌وره‌که‌ن

دوعای بەربانگیان بردین تا لەو دنیاش هەر ئێمە بسووتێین
گوتی: ئاخ.. ئاخ
ئاخ.. ئەمانە بە پیری ئەو شتانەیان دەسکەوت
کە لە منداڵیدا پێویستیان بووا

ئای دایە.. دایکی من و ئەو وەتەنەی پلەی گەرمای دەگاتە پەنجا و قسوور
هەرچەندە موسنا و سولاس و ڕوباع و توساع ژنم ناسیون
بەڵام کەسیان خۆشییان نەویستووم
ژنێک ترسەکانمی لە پەنادا بشارمەوە و
جوانییەکی ڕوون بداتە دنیای ئاڵۆزم
بمکاتەوە ناوێکی سادە
بە چاو تام بکرێت و تامێکی ئاشکراش بێ بۆ میوەیەکی شاراوە
نەخێر.. لە ژیانمدا ژنێک خۆشی نەویستم
شەوان وردە غەزەل و خۆشیی درشتم دەخستە باوەشیانەوە
کەچی ئەوان بە ناوی یارییەوە ماچیان بە پارە دەدامێ
لێوگەستن و ئاخ و ئۆفیان پەیوەست بوو بە ژمارەی لیرەکانەوە
چاوقایمانە دەیانگوت لیرەی زیاتر بدە و نقەی زیاتر ببیستە

میدالیاکانت فڕێدە چونکە لە سینگم دەچەقن
گۆزی فتقەکەت لێکەوە بۆنی ئیسفنجێک دەدا تەپڵەکی
جگەرەی سرپیبێتەوە
بە بێزاریی بێوەژنێک کە لە گۆڕستاندا بە شوێن قەبرێکدا
بگەڕێ
لە شمشێری پیاوەتیم دەگەڕان
بەیانیانیش لە جێگەکەمدا دەستم بۆ دەگێڕان و لە پاڵمدا
نەمابوون
گیرفانەکانیان پشکنیبووم
موورووی سەوڵەجانەکەمیان بردبوو
یان چوارچێوەی ئاڵتوونیی چاویلکەکەمیان دەدزی
یان بە ددان ئەستێرەی ئەڵماسی سەر شانی پاڵتۆ
سەربازییەکەمیان قرتاندبوو
لەبری نامەی دڵداری، لەجیاتی لە دڵەوە بۆ گوڵ
عەریزەی عەرزەوەرگرتنیان بۆ دەناردم
لە دواییشدا، لە دانیشتنی بەردەرگا و جلشۆرین و چنینەوەی
لیفکەدا
بە تەنزەوە دەیانگوت زۆری دانا و کەمی برد..!
هەتا ئەو مەدرەسەی کچانی تەنیشت کۆشکە غەمبارەکەشم
دەرچوو مەدرەسە نەبوو

سەربۆیاخکراوەکانی حاشییەم کچەکانیان هێنابوو
گۆرەوی سپی و کورت بە قردێلەیان لە پێ کردبوون
بە تەوقە کەزیی دەسکردیان بەستابوو
منیش.. ئای دایە
بە حەربەکەم کونێکم لە تەلبەندی مەدرەسەکە کردبوو
دەمەوعەسـران لەسـەر ئـاگر چـاوەڕێی ئەو کـۆترە کچـانەم دەکرد
بە پسکویتی قونسولی ئێرانی و
بەو لەتەکەبـابە سـاردانەی لە پاسـەوانەکانم شـاردبۆوە ڕاوم دەکردن.
دەلاقە بوون لە گۆڕی تەنهاییم
قسەیان موتووربەکردنی ڕەعشە بوو بە درەختی جەستەمەوە
بە نیگایان ئاوی وەستاوی گۆمی گۆشەگیریم دەبووە هەڵم
فتقەکەم لە فیکە دەکەوت
وەک ئەوەی گونکە هەویر بێ
دەیانخسـتە نـاو لەپـی بە ئـارەق تەڕیـان و بە میهرەبـانی دەیانلاواندەوە
"بنوو، بچکۆلەکەم بنوو".
دەزوو بوون بۆ بەستنەوەی برینم بە سروشتەوە

درزێک بوون لێیەوە باران بە گونییەی وشکی دەسەڵاتم
دەکەوت
کە بەسەر باینجانی پیریی ڕۆژەکانمدا دادرابوو
تا ڕۆژێک.. ئای دایە
دایکی من و ئەو خەراباتەی پلەی گەرمای دەگاتە پەنجا و
قسوور
تا ڕۆژێک بە ڕێککەوت لە کچێکیانم پرسی پۆلی
چەندی؟
گوتی پۆلی چی بەڕێز؟!
من ناخوێنم
دەستی برد و کەزییە دەسکردەکەی لێ کردەوە
سەدرییەی لەسەر سکە پڕەکەی لابرد
پێی گوترابوو مەترسە خەڵەفاوە و هیچی پێ نەماوە و
تەنیا لەتە پسکوویت بە گێلاسی لێوت و
بە قۆخی تەڕ و توکنت دادێنێ و تامی دەکا
ئای دایە، دایکی من و ئەو قیامەتەی پلەی گەرمای دەگاتە
حەفتا و قسوور
سکم بە خۆم سووتا کاتێ گوتی
پێم سەیرە تۆ پسکوویت بە ژێرەوەمان دادێنیت

لە کاتێکدا لە سەرەوە نان نییە بیخۆین.

زەعیم دەیەوێت سادە بژی
لەبەرچاوی کامێراکان
بەری نەشۆراوەی باخچەکان دەخوات و
وەک پسپۆڕێکی کشتوکاڵی بە پێکەنینەوە دەڵێت
پەیینی کەمە و
پاشەڕۆی بیست و شەش گوێدرێژی نەخەساوی بۆ تەرخان
کەن
بۆ ئەوەی لە میللەت نزیک بێ
چوارلای لاندگرۆزەرەکەی نارنجی کردووە
گوایە تەکسییە و بە نهێنی بە شوێن گرفتەکانی خەڵکدا
دەگەڕێ.

وێنەکانی، وشەکانی، قسەکانی، ماناکانی، ڕۆژەکانی،
بورجەکانی، کۆشکەکانی
پارچەی گومانن و بەسەر شۆستەکاندا ڕژاون
چوونەتە ناو پیاسەی خەڵک و
شەربەتی مێووژ و

پاقلەی کوڵاو و
زەرفی چەرەزات و چای خەڵووز
چوونەتە ناو نوزانەوەی نزمی منداڵە کلێنسفرۆشەکانی
سەرجادە
ناوی کۆمەڵە حەرفێکی دەرەوەی ئەلف و بێن و
نوقمی مەرەکەبی خەمە نەنووسراوەکانە
ئەو ئاڵایانەی لە باڵەخانەکانیدا دەشەکێنەوە
دەسرۆکەی خواحافیزین
دەسەسڕی فرمێسکن
دەسرۆکەی خواحافیزین لەو تەیرانەی ژێر باڵیان پڕە لە
متمانە
دەستەسڕی سڕینەوەی فرمێسکی ئەو منداڵانەیە
بە ڕۆژ عەبای دایکیان ڕادەکێشن بۆ کڕینی قەڵەمی ڕەنگ
شەویش بەدیار فانۆسەوە سەعی لە نەخشەی نیشتمان
دەکەن.
هەموو شەوێک لە خەودا خەون بە نووستنەوە دەبینێ
هەموو ڕۆژێک لە ئاگایدا کەسێک تیایدا نیشتەجێیە کە
نایناسێ

بەر دەخوات بەڵام دەستی لە جوانییەکانی درەخت بەربووە
لە کۆشکدایە بەڵام پێی لە خۆشییەکانی پیاسە بەربووە
کۆتری هەیە و بێ پەنجەرەی دۆست
ترێی هەیە و شەرابی نییە
هاواری هەیە و نابێتە گۆرانی
بۆ نەدەکرا بۆ لیرە و جوانی لەسەر یەک چرپا بخەون؟!
ئاخر ناشێت نان و زنجیر لەسەر یەک سفرە دانیشن
ئەوەی کەشتی هەبێت نابێتە خاوەنی با
جوانی ناتنووسێ گەر دزێوی بتخوێنێتەوە
ئەوەی دیواری هەبێت
لەوانەیە لێ نەگەڕێ نەخۆشی بێتە ژوورەوە
بەڵام مردنی بەستاوەتەوە
دەشێ شوراکان ڕێگە لە وەڵام بگرن
بەڵام پرسیاریان پێ زیندانی ناکرێ.

هێڵی تەمەن لە دەستەکانیدا نابینرێ
ناولەپی وەک پێستی سکی بۆقێکی پیر
ساف و جیرە

زەعیم

زیندوویەکی دیاری

مردنێکی نادیارە.

## لەبەر ئاوازێک نایەوێ ببێتە گۆرانی

أبِنْتَ الدّهْرِ عندي كُلُ بِنْتٍ
فكَيفَ وَصَلْتِ أنتِ منَ الزحامِ؟

المتنبی*

ئاوێک دەناسم هەموو سیفەتێکی ئاگری هەیە

گەر ئەبجەدییەت بە هانام بێ
پێش ئەوەی مێژوونووسان بێن من دەتنووسمەوە
هەر تۆ براوەیت
من لە پەنجەرەی زیندانی زمانەوە
لە باخچەی موعجیزەکانت دەڕوانم
تۆش درەختی لەزەتی و بنەچەت دەچێتەوە سەر مەجاز

---

* موتەنەبی ئەم شیعرەی بە نەخۆشی گوتووە و گرانەتای بووە، ماناکەشی بەم شێوەیە دێتەوە: گەر لە فرمێسک و بەڵای ڕۆژگار دەپرسی، هەموو فرمێسک و بەڵایەکم هەیە، لە قەرەباڵخیی ئەو هەموو فرمێسک و بەڵایەی دەوری داوم، تۆ چۆن گەیشتیە لام، بە کوێدا هاتیت؟!

تامێکی دیاری بۆ میوەیەکی نادیار و
بە  غوباری گێڕانەوەم نالەرزیت
چەند لە دنیا دەچیت
هەر پێش دەکەویت بەڵام ئاوڕ نادەیتەوە
چەند لە شێتییەوە نزیکم
پێم ناخۆشە بچیتە سەربان و تانکیی ئاوەکە پڕکەیت
بچیتە سەر ئەزمڕ و چای خەڵووز بخۆیتەوە
لەو بەرزاییە خودا جوانیت ببینێ  بۆ خۆیت دەباتەوە
پێم خۆشە پێبکەنیت
تریقەت هەڵوەرێ و بفڕێ و
بەسەر باڵەخانەکاندا ببێتە ئاڵا
تۆ هەبیت ئاژاوەی دنیا نامێنێ
بەندیخانەکان دەبنە دایەنگە
تاوانبارەکان بە دەنکە شقارتە
پیکابی بچووک بۆ منداڵە هەژارەکان دروست دەکەن
جنێوەکان لە فەرهەنگی خاڵدا دەسڕێنەوە
قەسابەکان تا ماون بۆ ئەوە دەگرین
لەبری چەقۆ گیتاریان هەڵنەگرتووە
ئەوانەی ئێواران بەدەم ڕێوە پاقلە دەخۆن
توێکڵەکە دەخەنە گیرفانیانەوە
هەموو ئەوانەی ماسییان برژاندووە داوای لێبوردن دەکەن

تۆ لەسەرتە ڕۆژانە جارێک پیاسە بکەیت
پێڵاوەکانت داکەنە و بە پێخاوسی بگەڕێ
ڕێگا قیرتاوکراوەکان دەبنە پسکویتی بە قاوە
ڕێگا خۆڵەکان بەوەوە دەنازن گوایە ئەسڵت قوڕە و
بە خزمایەتییەکی دوور پێت دەگەنەوە
سڵاوت لە هەر کێ کرد چاوەڕێی وەڵام مەبە
ئەوەی تۆ ببینێ باشە
بە غەمزەیەک عەموودەکانی سەرجادە کون کون کە دەبنە شمشاڵ
بتڵە ئاوە مەعدەنییەکانی سەر شۆستە بە پۆزەوە خۆیان بە کانی دەزانن
سەبووریی ئەو شوتییە بەستەزمانانە بدەوە
بە هەنجەتی باشییەوە بە چەقۆ سکیان هەڵدەدەڕن
دڵی ئەو درەختانە ڕابگرە
بە ناوی جوانکردنی شارەوە لە باخچە دایانبڕیون
قاپ و تەشتی نایلۆنی سەر عەرەبانە گەڕۆکەکان
بگۆڕە بۆ پارچەی پیانۆ
بە دوو سایەکەی لای ماڵتان وەرە خوارێ
با سایلۆ پڕ بێ لە گەنم
پڕ بێ لە گوارە بۆ ئەو کچانەی لەمساڵدا گوێیان دەسمرێ
پڕی کە لە عەتر بۆ ئەو نامانەی هێشتا نەنێردراون

دوو ماچ بۆ هاوین فڕێدە فێنک فێنک دەبێتەوە
قژت لە دواوە ببەستە چیتر ڕەشەبا نامێنێ و
ئەو خانووانە دەحەسێنەوە ڕووەو قیبلە نین
لەبەر خاتری ئەو ساوایانەی دەیانەوێ نیوەڕۆیان بخەون
خۆت لە خۆڵبارین توورە کە
دوای نیوە شەو لەپێکت پڕکە لە تریفە
لەپێکت پڕکە لە حەرفەکانی ناوت
بچۆرە لای سینەماکان
با سوالکەر و عەرەبە نووستووەکانی سەر کارتۆن و بەتانیی عەسکەری
ئەلفی سەرەتای ناوت چەشنی چۆرەک بکرۆژن و
قومێک ڕووناکی بخۆنەوە و متمانەیان بە دنیا بێتەوە.

تۆ لەسەرتە هەفتەی جارێک بچیتە چێشتخانەی یاقووت
میوانەکان مینیۆی جەستەت ببینن و لە خۆیانەوە تێر بخۆن
مەمکی مەحشی بە شیر و هەنگوین
سینگی بە خاڵ وەک نانی بە کونجی
پەنجەی پێچراو بە گەڵای مێو
گەردنی تەڕ بە ئاوی شووتی
تکەی تەنووریی تەماشا و
سووپی سووری سووراو و

شیلەی مەیلەوسوێری ئارەقی چاڵی چەناگەت بخۆنەوە
تۆ لەسەرتە ڕۆژێ جارێک بچیتە نەخۆشخانەی فێرکاری
نەخۆشەکان ماچکە چاک دەبنەوە
برۆت لە شێوەی (لا) گرژ کە
مردن لەو ناوە نامێنێ
سەرێکی ژێر پردەکە بدە و
پەتی پێی ئەو قازانە بپچڕێنە سپێتیی باڵیان لە ڕۆحت و
خرپنیان لە قوڵ و باسکت خواستووە
دەرگای قەفەسی مریشکەکان بکەوە با بتبینن و
دوا نیازی بەر لە سەربڕینیان بێتەدی
تۆ لەسەرتە ساڵی جارێک بچیتە گەرمیان
لە هەردەی زەنــگەنە و چەم داوێ خــۆت ڕووت کەوە و
ڕاکشێ
با بەرخەکان لە گیای بەر و ژێر باڵت بخۆن و
لە تووکی نەرمی بناگوێت بلەوەڕن
بەردێکی بچووک بخەرە درزی مەمکەکانت با ئارەق بکا و
وشکەساڵی نەمێنێ.

بەیانیانی هەینی بە دزییەوە بچۆرە سەر قەبری باوکت
مردووەکان بتبینن بەو خەفەتە دەمرنەوە
لە زەمەنی تۆدا نەژیاون

وەکو چوکلێت مانا بپێچەوە و
بیخەرە دەمی توخمەکانەوە
بە هەناسەم بڵێ کە هەردەم بە دواتەوەیە
ببێـتە گســک و پیربـوونە ڕژاوەکـانی بەردەم مزگەوتەکـان
کۆکاتەوە
کە نووستیت دەرگا جوان جوان قفڵدە
با ئاواز بەڕەڵا نەبێ دراوسێکانت بشڵەژێن
پەردەکان جوان جوان دادەوە
با ئەستێرە نەیەتە ژوورەوە نووری نێوچەوانت بدزێ
کە لە خەو هەڵسایت باوێشک نەدەیت
دەمت مەکەرەوە با ددانێکت نەبێتە ئیمامی تەسبیحی کرمان
پێش ئەوەی بچیتە حەمام خۆت بپشکنە
بزانە هیچت لێ نەدزراوە؟!
هێڵەکانی لەپت نەچۆتە شوێنی ئایەتە هەڵواسراوەکە؟!
لەتەنانە ڕەقەکانی ناو سەبەتەکە
نەرمایی گوێتیان نەدزیوە؟!
چاڵی ناوکت وەک خۆی ماوە و پڕ نەبووە لە هەنگ؟!
درەختێکی باخچەکەتان
سەوزیی وردە دەمارە سەوزەکانی ڕوومەتی نەبردووی؟!
بزانە خۆت خۆتی؟!
گێلاسی ناو ڕەسمی دیواری مەتبەخەکە

بۆیەی نینۆکەکانی تاڵان نەکردووی؟!
لەبەر چاوی مەرکانەی گەڵاکانت ددانت نەشۆی
مەیانکە بە دوژمنی نەعنای ناو مەعجوونەکە
کە چات خواردەوە سەیری کووپەکە نەکەیت دەنا دەبێتە
ئینجانە
شەکری تێمەکە منی تێدام و بە کەوچکەکە تێکمەدە
بە چەتاڵ پەنیر بخۆ
پەنجەت بەری کەوێ دەتوێتەوە و دەچێتەوە دۆخی منداڵیی
خۆی و
دەبێتەوە شیر
سەموون کەرت نەکەی گەنممان لێ مەڕەنجێنە
بەزەییت بە شتەکاندا بێتەوە
سابوونەکە حەز دەکا بە دەستت بیشۆیت و پاک بێتەوە
خاولییەکەت حەز دەکا بە قژی وشکت تەڕی کەیت
پێڵاوەکەت ئیرەیی بە سیسەمەکەت دەبا لەسەری دەخەویت
سیسەمەکەت ڕقی لە پێڵاوەکەتە دەیبەیتە دەوام
کتێبەکانت ئامادەن خۆیان بە دەفتەرە گەورە چلکنەکەی
دائیرە بگۆڕنەوە
کە هەموو بەیانییەک ئیمزایەکی لەسەر دەکەی زۆر لە
سەری بولبول دەچێ
ئامان جلت هەڵخست ئاگاداربە

سەرچەفەکان نەبنە باڵ و بتکەنە فریشتە و بتفڕێننە ئاسمان
زوو زوو دەرگای سەلاجەکە بکەرەوە
ماستی ناو مەنجەڵەکە و نانە هەورامییەکە و
باینجانی ناو نایلۆن و شرووبی تا چاوەڕێتن و
هانا بۆ مەڵهەمی سووتانەکە دەبەن
کەڵەشێری بەستووی ناو فرێزەر و
ماسیی ڕاکشاوی ناو قوتووەکەش بە خەبەرن و غەریبیت دەکەن.

بەیانیان ڕۆژنامە بخوێنەوە
تا تیرۆریستەکان بینەوە دەروێش و
لەسەر دەستی تۆ لەو کاتەی بە کەفاوی جلشۆرینە تۆبە بکەن
با تانکەرەکانی نەوت بگەڕێنەوە و
شەربەتی ئەناناس و شەرابی ترێ لە چاوتا بارکەن
لەبەردەم ماڵتاندا ڕیز ببەستن و
یەکە و سی و شەش هەزار لیتر ڕەنگ بۆ دنیا ئاودیو بکەن
لەجیاتی نەوتی ڕەش ڕەشێتی ماسکاراکەت
لەبری نەوتی سپی سپێتی ڕۆحت بگوازنەوە
سەیرێکی هەواڵە ناوخۆییەکان بکە
با ژنەکان خۆیان نەسووتێنن و پرێمز بچێتە مۆزەخانەوە.

نا ڕۆژنامە مەخوێنەوە
جوانیت ناخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە
تەنیا سەیرم کە
چونکە جوانترین هەواڵ لە چاومدایە.

## ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبم بە خۆم

(بۆ دیواربەندەکەی مەحموود دەرویش)

ڕۆژێ دادێ دەبم بەو کەسەی دەمەوێ
بە بۆنی حەرفی یەکەمی ناوێک کە نایدرکێنم
درێژە بە گەشتی یەکەمم دەدەم بەرەو مانا
ڕێگەیەک دەدۆزمەوە بۆ دۆزینەوەی خۆم
لەو ئاگرانە سڵ ناکەمەوە کە بازدەدەنە سەر جوانی
دەخیلەی کات و شوێن دەشکێنم
قازێ دەکرم
پەڕەکانی سوێی مەغریبان بکاتەوە
وشەیەک پەیدا دەکەم
نهێنیی پەلکەزێڕینە بزانێ و ببێتە برادەرم.

ڕۆژێ دادێ لە ناو ئێمەدا خۆم دەردێنم
بەبێ منەت لەناو ناوی خۆم نیشتەجێ دەبم
بە ڕوونی لە ئاڵۆزیدا دادەنیشم
خەیاڵم کۆدەکەمەوە
لە باڵندە پەند وەردەگرم تا باڵی گەرمتر دابێت
لە جوانی نزیکتر بۆتەوە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبمە شاعیر
زمانم دەکەمە مەجازی مەجاز
گوێم لە گریانی ئەو دارقامیشانە دەبێ
کە بێچووەکانیان بوونەتە شمشاڵ
لە پرسەی ئەو سنەوبەرانەش دادەنیشم
کە لقەکانیان کراونەتە دەسکی قەنەفە
دڵی توێکڵە پرتەقاڵەکانی سەرجادە دەدەمەوە
کە لە ماڵی تامەوە دەرکراون
لەگەڵ سروشت ئاشت دەبمەوە
دەبمە وەرگێڕی نێوان گوڵ و پەپوولە
کە بە دوو زمانی جیاواز یەکتر تالان دەکەن
ڕێزی توخمەکان دەگرم
بە ئاو دەڵێم ئاو مانای دیکەی پێ نابەخشم
غەدری دووەمی لێ ناکەم.

لیرەیەکی زۆر کۆدەکەمەوە
ڕۆشنایی پێ دەکڕم
مانگ لە هەژمەتا بیێتە نیوە
ڕۆژەکانم بە خۆڵ دەشۆم
پێڵاوەکانم دەسڕمەوە و بە فیزێکەوە ڕێ دەکەم و
بڕیار دەدەم کە دڵشادم.

ڕۆژێ لە ڕۆژان دەست لە غروری زیندووان هەڵدەگرم
بە دەنگی بەرز ئەو حیکایەتانە دەگێڕمەوە
کە تۆز دەخەنە سەر کیمیای مێژووم
بێبەری دەبم لەو ڕۆژانەی
کە سپێتیی دڵم تێکەڵ بە ئێوارەیان نەبووە.

پێم سەیر نابێ چۆلەکەکان دەنووک لە شان و ملی
یارە ئەسمەرەکەم بگرن
لەو دوورەوە بە نانی گەنمی دەزانن.

چەشنی مشتە خوێیەک لە ژیاندا دەتوێمەوە
دەشزانم تام نادمە جامێ ئاوی ئەم دنیایە

هەوڵ دەدەم
باوەڕ بە مەحوی بێنم
کە پێویستە قومێ عەقڵ لە دەفری مارکس بخواتەوە.

بە عەنبەر خاتوون دەڵێم
بۆدلێر مەولەوییێکی ترە.

دەپرسم بۆچی ڕۆژانە مانگ خۆی دەشارێتەوە و
شەویش نییە هەتاو یەخەی نەگرێ
داوای ئەو تیشکەی لێ دەکاتەوە کە بە قەرز پێی داوە.

دەگۆڕێم
تێدەکۆشم نان ئینکاریم لێ نەکا
خۆشەویستی دەسەنمەوە
لە هەولێر بە قوربانی ژنێک دەبم
لە ئەستەنبووڵ لە مزگەوتی ئایاسۆفیا تۆبە دەکەم.

ڕەنگی ئاسمانی و خاکی ئاشت دەکەمەوە
کە لەوەتەی هەن گاڵتە بەیەکتر دەکەن.

ئاسمان بە ئاگا دەهێنمەوە هەڵە نەکات

تەنیا مرۆڤ دەخوێنێتەوە و
نووسەر نییە.

مژدە دەدەمە ئەو درەختەی جێگەی یەکەم ژووانم بووە
خۆت بە دارستان بزانە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان بەتاڵ دەبمەوە لە توندڕەوییم بۆ شوێن
خۆم ڕادێنم کە زەمەنیش تەنیا وشەیەک بێت لە وشەکان
لە پەنا ژنێک خۆم دەشارمەوە
ئەم دنیا ئاڵۆزە
پێویستی بە پەیداکردنی جوانییەکی ڕوون هەیە.

ڕۆژێ دادێ
تەیرێک لەسەر شانم دەنیشێتەوە و دەبمە پاشا
بڕیار دەردەکەم بە قژی منداڵ بڵێن گوڵەگەنم
مامز دەکەمە مامانی شاعیر
دنیا جوان دەکەم پڵنگەکان لە بەتانیی منداڵەکان دەردەکەم
و
پڕی دەکەم لە جووجکەی خڕپن.

زۆر مەمنوونی سێو دەبم

پیرۆزبایشی لێ دەکەم
باوەڕی بە ئادەم هێنا نوێخواز بێ.

ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆم بە گرنگ دەزانم
دەنووسم بزنەکێوی و دەیخەمە ناو دوو کەوانە
لە شێوەی باپیرانم بە دەوریدا هەڵدەپەڕم
بە گەڵایەک بۆ عەورەتم وازدێنم
چڵەزەیتوونەکان دەشارمەوە و
لە کۆتر دەپرسم تۆفان لە کوێیە؟!

لەگەڵ مندا دار و بەردیش سەربوردەی تایبەتییان دەبێت
دار بۆ مرۆڤ یارە یا نەیار؟!
چۆن هەردوو سەری دارەکەی پێ دەگیرێ
بێشکە و تابووت؟!
ڕێزی بەرد ناگرم
لەم ڕۆژگارە ناخۆشەشدا بڕیاری داوە نەجووڵێ و
بەردێ نەخاتە سەر بەردێ.

دنیا غوبارە و هەژارییش با
دەستی کراوەی سواڵکەرێک
بەڵگەی هاوکاریی شێتییە لەگەڵ ڕۆژگار

دەبمە ئەندامی خێزانی پرسیار
وەلام دەرگام لێ دەگرێ
دەبمە گومان لە پەنجەرەی پرسیارێکەوە ڕادەکەم.

ڕۆژێ لە ڕۆژان بەلەمێک دەدزم
برادەرە نزیکەکانم دەبەمە پیاسە
سێبەری هەورێ بە کرێ دەگرین
بەیەکەوە تا سکمان دێشێ بە مێژوو پێدەکەنین.

ڕۆژێ لە ڕۆژان نابمە کەس
ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبمە خۆم.

## به بۆنەی چۆلەکەیەک بەسەر شانی داهۆڵەوە

**(بۆ هانەی کچم)**

ئیرەیی بە چاوی منداڵەکەم دەبەم
دەتوانێ ڕکە بگرێت تا ڕووناکی بێتە پلیکانە و خۆر تام بکات
بادەم ماچ بکات و چیرۆک بخاتە پارووە نانێکەوە
دەتوانێ هاوین بخاتە جانتاوە و خۆی پێ هەڵکێشێ
باران لای ئەو بۆ نانەوەی قوڕە و بەس
ئەو تاسەکانی جادە نابینێ و
بە پسکویتێکی بە قیڕی دەزانێ
بەیانیان لە بری ئیمزای دائیرە قاچی بووکەکەی دەشوا.

بە دەم شیرخواردنەوە لە بەرگی کتێبەکانم دەڕوانێت و
داوای شمشێرەکەی جەنگیزخان دەکات
بۆ دروستکردنی زەلاتە.

لە نهێنیی بوونی دیوار ناگات و
درزی گەچەکان بە نووکی قەڵەم تێدەگا

که دوای مێرووله‌یه‌ک که‌وتووه

بێ ئاگایه له غه‌دری مرۆڤ له ئاست ئاسندا
کاتێک ده‌کرێته قفڵ یا زنجیر
تاکه خه‌می په‌یداکردنی بزنێکه
پێڵاوی له‌پێدا بێت.

به سه‌رسوڕمانه‌وه ده‌ڕوانێته ئه‌و که‌سانه‌ی
بۆ سه‌وداکردنی پارچه قوماشێک شینومۆر بوونه‌ته‌وه
به‌و زلییه‌وه کرێنی په‌تاته‌یان به جددی وه‌رگرتووه
گه‌مژه نییه تا ئه‌و ڕاده‌یه‌ی ڕایگه‌یه‌نێت دنیا به بوونی ئه‌وه‌وه جوانه
له کتێب دوودڵم ده‌کات
ئێ کاتێ ددانێکت دێشێ
سوودی چییه دانتێ بناسی یان نا؟!

بێ ئه‌وه‌ی شاعیر بێت ساتمه له قافیه ناکا
باینجانی هێنده‌ی پرته‌قاڵ خۆش ده‌وێ
لای ئه‌و هه‌موو نه‌خۆشێک به ماچ چاک ده‌بێته‌وه
کولله په‌پووله‌یه‌کی ساده‌یه
ئاساییه لای پشیله‌یه‌ک له‌سه‌ر سفره‌که‌ی شوێنی هه‌بێت
یان ڕیشۆڵه‌یه‌ک ببێته حاکم

بە دەستە بچووکەکانی داکۆکی لەو بەرازە دەکات
کە جووتیارێک لە فیلمێکی کارتۆنیدا
لە کێڵگەی برنج دەیکاتە دەرەوە.

ئەو شاگەشکەیە بە ڕەنگەکان
بۆیە لەلای دڵۆپەخوێنێک و خونچەیەک هاوڕێن.

دوور لە ئەندێشە
لای ئەو تاریکی تەنیا پەیوەندی بە خەوتنەوە هەیە.

کات لە دڵیدا نەمامێکی سەوزە
شوێن لە دەرەوەیدا شتەکان ناشێوێنێ
عەقڵ توخمەکان بەرباد ناکا و هەموو شتێکیش بە جەستە ئاشت دەبێتەوە.

بۆ ئەو بەرخەی لە باخچەدا زیندانە
گیرفانی پڕ نوقڵ و قافیە دەکا
بێئاگا لەوەی یارەکەی پڕۆژەیەکە بۆ خوان.

نرخی شتەکان نازانێت
ئەو ئاکارێکی مەبەستە لە دەمی خواردندا دەم نەکاتەوە

هەموو سامانی ئەوەیە کە دەتوانێت بیست کاشی شۆستە
بژمێرێت
ئامۆژگاری قاپە پیسەکان دەکات جارێکی دی یاری بە
خواردن نەکەن.

ماڵی دڵی هێند پتەوە هیچ سەرنجێکی لەبارەی ڕەشەباوە نییە
بە ئاوەژوویی وەڵامی پرسیارەکانی دەدەمەوە
گەورەی ناکەم و تەونی خەونی ناشێوێنم
پێی ناڵێم ناتوانێت بە پایسکلی سێ تایە بچێتە سەر مانگ
دەریا لەو تەشتە گەورەترە کە مەلەی تێدا دەکات
ئاسمان لەو کڵاوەی فراوانترە هەرچەندە دوو ورچی تێدایە
پێی ناڵێم لە هاویندا زەوی بە شرووبی تا فێنک نابێتەوە
ئەو ڕاستییەی بۆ ڕاست ناکەمەوە
کە پێی وایە هەموومان ئەسڵمان لە خێزانی مەیموونە

با هەر وا تێبگات
ئەستێرەکان پارچەی شکاوی ئەو ئاوێنەیە
کە باپیرەی ڕیشی لە بەردەم دەتاشی
با هەر وا تێبگات مردن یەکێکە لە خزمەکان

ئیرەیی بە چاوی منداڵەکەم دەبەم
تەمەن هێشتا لە فێربوونی نەخستووە
ڕیزکردنی نەعل دەکاتە باخچەی هەڵواسراو
زانین ددانەکانی کلۆر نەکردووە
جوگرافیای ئەو هەر هێندەیە جۆلانەیەک دەشێت ببێتە نیشتمان
ماتماتیکی ئەو سادەیە
چوونە دەرەوەی گەورەیەک
یەکسانە بە هێنانەوەی چەند نەستەلەیەک.

ڕۆژێک دادێ خۆی دەبێتە حیکایەتێک کە بۆ لایلایە دەست نادا
دەبێتە ئاو بەڵام بە شایەتیی سەراب
دەبێتە هەور بەڵام بۆ خزمایەتیی لم
دەبێتە باران بەڵام بۆ کوژاندنەوەی ڕۆژگار
گەورە دەبێ و بڕوا دێنێ ئەم دنیایە کەشتیی نووحە و هەژاریی لێ بار نەکراوە. ئەم دنیایە هەتا نابێتە سۆتەکیش بۆ جگەرەی پیرەمێردێک بە دیار فرۆشتنی تەسبیحەوە وەنەوەز دەدا
بڕوا دێنێ چاوی بۆ ژماردنی پۆلە ڕیشۆڵەی پایزان چێ نەکراوە

بەڵکو بۆ گریان

گەورە دەبێ و لە چاوشارکێکانی پەشیمان دەبێتەوە و
تێدەگا کەس شایەن نییە بە شوێنیدا بگەڕێی
گەورە دەبێ و تێدەگا
گەر هەموو گیاندارانی دنیاش ماچ بکات کەسیان نابن بە
شازادە
گەورە دەبێ و بۆ بینینی کەروێشکێک بلیت دەبڕێ
خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ خواردنی ماسی
ڕقی لە ڕەشەبا دەبێ و
وردە وردە خۆی بەبێ ویستی خۆی
دەبێتە یەکێک لە یەکەکان و
لە ناو دەرەوەی خۆیدا
لە ئەوانی دیدا دەتوێتەوە

ئیرەیی بە چاوی منداڵەکەم دەبەم
بۆ ئیرەیی بە چاوی منداڵەکەم نەبەم؟!



## خۆشەویستیت بەرواری بەسەرچوونی نییە

حەبیبە ڕۆح ماڵی خۆتە بیبە

نالی

## ئیمان

باوەڕم بە جوانیت کرد و

کەوتمە ناو ئاگرتەوە

دەرچوو کە باوەڕ هەیە ناتباتە بەهەشت!

## فێڵ له ناسینت ناکرێ

کتێبی باشم هەیە، برادەری باشتر

ئەوانەی لە ناخەوە دارماون لە هەموو کەس زیاتر پێویستیان

بەوە هەیە خۆشەویست بن

زوو زوو خۆم دەشۆم و عەتری خۆش لە جلەکانم دەدەم و

بەدەم ڕێوە لەبەرخۆمەوە گۆرانییەک دەڵێم، کە یادگارییم

لەگەڵی نەبووە، وێنە لەگەڵ خزمەکانم دەگرم و هەوڵیش

دەدەم سەعاتەکەم دەرکەوێ، پارە دەدەمە سواڵکەران و لە

چایخانە جگەرە دەدەمە شێتەکان و بە ناخۆشترین گۆرانی

سەر بادەدەم و بە بێماناترین نوکتە پێدەکەنم. لەو

تەسبیحانەی پیرەمێردێک بۆ فرۆشتن لە باسکی ئاڵاندوون بە

جددی ورد دەبمەوە

لەبارەی نایەکسانییەوە خۆم شینومۆر دەکەمەوە

لە تەندروستیی ئەوانە دەپرسم کە بەر لە تۆ ناسیومن

هەر دەمەوێ باوەڕ بێنم کە ڕازیم و عەیبم نییە

بێسوودە

هەموو ئەو خۆشـییانەم تـاقی کـردەوە گـوایە ناخۆشـیی بـێ

تۆییم لەبیر دەبەنەوە

## تاقانه

تەنیا تۆ گەورە نابیت

لە جوانیت دڵنیام

خەمی ئەوەمە کە ئێمە پیر بووین بە تەنیا لێرە چی بکەیت؟!

## خۆڵەمێش

بە تۆوە بەندە

لێرە نەبێت ڕەنگ نامێنێت

بەهار هەر دەڵێی بە قەڵەم ڕەساس دروست کراوە.

## قەفەس

بێ بەرامبەر خۆشم دەوێی

وەک ئەو چۆلەکەیەی

بەبێ کرێ لەناو قەفەسێکدا دەخوێنێ..

**بەقەرە زاحیکە**

نانی بەیانی دەخۆم و بیر لە تۆ دەکەمەوە

ڕێک بە ئاراستەی پیاڵەکەم

مێروولەکـــان قەتارەیـــان بەســـتووە و دەنـــکە شـــەکریان

هەڵگرتووە

مانگای سەر قوتووی پەنیرەکەش دڵی خۆشە و پێدەکەنێ.

## متمانە

کە "بەیانی باش"م لێ دەکەی

ژنە عەبا لەسەرەکان بە زەمبیلەوە دێن و

لە باشیمدا بازاڕ دەکەن.

## وانه

هەقە لە وانەی زیندەوەرزانیدا ناوت هەبێت

سەیرکە مرۆڤ ڕیژەی ئاو لە لەشیدا سەداحەفتایە و

بە نیگایەکت دەسووتێ.

## هاوکێشه

دەزانم بە جیابوونەوە لە تۆ نامرم

بەڵام نازانم چی لە ژیان بکەم؟!

**شەمائیل**

بە گەردنت

بیری ئەو کێکە زەردەم دەکەوێتەوە

کە لە منداڵیمدا

داپیرەم بە دزیی هەژارییەوە دەیدامێ.

## شەکرە

بەسەر سەرمەوە مەوەستە

قەت لە خەفەتی ئەو کەسە ناگەیت

شەکرەی هەیە و لە سێبەری دارهەنجیرێک دانیشتووە.

**زۆراب**

تەماشات دەکەم و دەنووسم

تەماشات دەکەم و دەنووسم

وەکو ئەو منداڵانەی سەر بۆ سەبوورە هەڵدەبڕن و

پیــت لە دوای پیــت وشــەی مێــووژ بــۆ دەفتەرەکانیــان

دەگوازنەوە.

## دڵۆپە

سەرم شۆڕکردۆتەوە و بەگریانەوە بۆت دەنووسم
ئەو مۆبایلەم وەکو ئەو قاپە فافۆنە دێتە بەرچاو
کە داپیرەم زستانان لەژێر دڵۆپەی سەقفەکەی دادەنا.

## جەرگم

لە تۆ باشترم نەدیوە
تۆ ئەو کەسەیت کە شەوان درەنگ برسیمان دەبوو
بۆ هەردووکمان گۆرانییەکت دەکردە نیوە.

## سەرسوڕمان

لەژێریدا وەستابوویت
عەموودەکە بە وێنەی دڕاوی کاندیدەکان داپۆشرابوو
نە من دەنگم هات و نە ئەوانیش دەنگیان هێنا.

## سڵاو

دەست جووڵاندنم

لە سڕینەوەی پەنجەرەش

هەر بە خەیاڵی سڵاوێکە لە تۆ.

## مۆسیقا

جار جارە کە برینێکت دەکولێتەوە

یادەوەرییەکی نەرمی بخەرە ناو و بەگۆرانییەک بیپێچەوە

لە منی وەرگرە شەڕی نەمانی سڵاوی ئازیزان

تەنیا بە مۆسیقا دەکرێت.

## گرتە

هەموو خەیاڵم لای تۆیە و لەگەڵ خەڵکیش قسە دەکەم
هەمان حاڵی ئەو کەسەیە
لە وێنەیەکی جەماعیدا تەنیا دەستێکی دەرچووە.

## گریان

باران بوو

بانگم نەکردیت

چونکە ئەوەی دەمویست لە چاومدا بیبینی

بە چەترەکەتدا دەهاتە خوارەوە.

## چرۆ

واز بێنە سەیری ئەم گوڵە پرتەقاڵە مەکە
با بۆ خۆی ببێتە پرتەقاڵ
سەیری منت کرد و بوومە کەسێکی تر.

## ئەمانەت

لە هەفتەیەکدا حەوت ڕۆژی بێ سوودم هەنە

تۆ هەر نایەیت

بۆت دەنێرم بیدە بەو کەسانەی دەتبینن.

**شاردنەوە**

بەرامبەرت پێدەکەنم و زامی دڵم دەشارمەوە
وەک چۆن جاران لە میوانداری بە چاک و چۆنییەکی
گەرم
کونی گۆرەویەکەم دەشاردەوە.

## نامەیەک

ئەو ڕۆژەی ئەمڕۆ بڕیت سوپاسی ڕابردووی دەکەم.

## چاکە

دیاری من سەعاتێکی دەست بوو

خوا هەڵناگرێ

دیاری ئەویش کاتێکی زۆری چاوەڕوانی.

## تاڵان

لە بازاڕی کۆنەدا دیقەتی توحفەت دەدا

من بەس نەبووم

دەتەوێ ئەو شتانەش بەریت کە یادگاریی کەسانی دیکەن؟!

## خۆزگە

ئەو کونانەی لە پێڵاوە هاوینییەکەمدا بۆ فێنکی دانراون

بریا لە سووتانم بۆ تۆ دەبوون.

## تەون

لە پاژنەی ئەو پێڵاوەی
بڕیاربوو کە هاتییەوە بۆ ژووانت لە پێی بکەم
جاڵجاڵۆکە تەونێکی جوانی کردووە.

## کەشوهەوا

لەگەڵ هەواڵەکانی کەشناسیدا خۆی بیرکەوتەوە
دڵێکی تاریک بە پەڵە خەفەت و
لە چاوەکانیدا ئەگەری تاوەگریان هەیە.

## گیرۆده

که پیر دەبم لەو هەموو وانە و ئەزموونە
چۆن باوەڕ بە نەوەکانم بێنم
تەنیا چاوەکانت شایەنی گێڕانەوەن؟!

## مووروو

چاکەت لەسەر ڕەنگیش زۆرە
زمرودی سەوزی ملوانکەت لەسەر گەردنی زەردت
بەهار و پایزی ئاشت کردۆتەوە
سوور خۆی گەرمە لەڕێی مووررووی گوارەتەوە
بە لاجانگی سپیت دەکەوێ و فێنک فێنک دەبێتەوە.

## ترێ

له بازاڕیش سندووقه ترێم خۆش دەوێ

لێی دەڕوانم و هەزاران هەزار چاوی تۆ سەیرم دەکەن.

## توحفه

جوانیت ئاسەواری هەیە

کورد هەر ناچێتە ناو مێژوو

لە کۆتاییدا بە هۆی تۆوە دەچینە مۆزەخانەوە.

**بازوو**

ئەو تەسبیحە قەزوانەی لە مەچەکتە شایەتە

ئەوانەی دەتبینن دڵیان سەد و یەک جار لێ دەدا.

## شایی

ئەو ورچە بچکۆڵەیەی بە ئاوێنەی ئۆتۆمبێلەکەتدا هەڵواسراوە
ڕۆژانە تێر تێر لە هەنگوینی چاوت دەخوا و
لە خۆشییاندا هەر دێ و دەچێ.

## پشتێنە

مۆڵەتی ئۆتۆمبێلەکەم تازە کردەوە
پارەی سەرپێچییەکەم دا
کێشە ئەوەیە بێجگە لە دەستلەملانێ
شتێکی تر بە پشتێنەی سەلامەتی نازانم.

## کووران

جامی سەیارەکەت بکەوە

لە من مەبە هەمان ئەو پاقلاوەیەی

بە منداڵی

بە حەسرەتەوە لەپشت شووشەی دوکانەوە لێم دەڕوانی.

## مۆڵەت

من و تۆ هەقە مۆڵەتی شوفێریمان بسووتێنین

کە ئەم دنیایە بۆ خۆی

هەر بەرەو ئەو شوێنە لێدەخوڕێ کە نامانەوێت.

## ڕاڤە

دەڵێم گەردنت بە ئارەقەوە جوانە و
بە ڕێی خۆمدا دەڕۆم
خۆشاوی مێووژی باڵەکایەتی بە کێ شی دەکرێتەوە؟!

**بەروار**

بە قسەی کێ هێڵی تەمەن لەناو لەپتدا کورتە؟!

باش وردبەوە

دڵنیام لێی نووسراوە

ئەو جوانییە بەرواری بەسەرچوونی نییە.

## هودنه

وەکو ئەوەی کۆتایی جەنگ بێت
دیلەکانمان گۆڕیەوە
دیارییەکانم وەرگرتەوە و دڵم بەجێ هێشت.

## ستارە

خوێندەواریی نەبوو

تۆی بینی

وەستای لەبغەکە  بە پەنجەی ناوکەفەوە

دڵ و تیرێکــی کــردە نەخشــی ســتارەی خــانووە تــازەکەی

دراوسێکەمانەوە.

## ڕاستی

هەموو شتەکانی تۆ کورتخایەن بوون

بەس شەوت لێ درێژ کردم.

**داهۆڵ**

پاش ئەوەی هەموو هەستەکانت بردم
جێت هێشتم
وەک ئەو داهۆڵەی دوای دروێنە کەس ئیشی پێ نامێنێ.

## گرافیتی

ئەوەی تۆ بناسێت

شتی ڕێکوپێک نانووسێ

وشەکان بە لای تۆدا خوار دەبنەوە.

## بەراورد

لە بەرامبەرماڵتان دانیشتووم و بینیم
ئەو مێروولەیە دەڕۆیشت و بۆ لەتەتوێکڵی گوڵەبەڕۆژەیەک
کتوپڕ گەڕایەوە
تۆش بەقەد یەک هەتاو یادگاریی درەوشاوەت لامە و
هەر بە خەیاڵیشتدا نایە.

## گرەو

ئەوەندە لەبەر خاتری من بکە

کە مردن هاتە لات

بڵێ کەسێک هێندە چاوەڕێمە

خۆی پەشیمان دەبێتەوە.

## شیر

نالی لە سەدەی نۆزدەمدا غەزەلێک دەهاوێ
لە سەدەی بیست و یەکدا بەر تۆ دەکەوێ
تۆ و حەبیبە بە خزمایەتیی جوانی دەگەنەوە یەک
من و نالییش وەک ئەوەیە دڵۆپێک نەوت بخەیتە کووپێک شیرەوە.

## حەسرەت

لە پیاسەی ڕۆژانەتدا

ئاراستەی جووڵەی چاوت نازانم

بەڵام پڕە لەو کەسانەی لەبەر جگەرەداگیرسانێک ئاگای لە

تۆ نەبووە

لەبەر تێکدانی پیاڵە چایەک سەری هەڵنەبڕیوە

لەبەر خوێندنەوەی ناوی دوکانێک سەیری سەرەوەی

کردووە و تێپەڕیویت

هەموو ئەوانەی لێت نزیک بوون

من لە دوورەوە ئیرەییان پێ دەبەم.

## دوو بزوێن

لە ڕێگــا بە دیــار گیــاخواردنی مانگــایەکەوە دەوەســتا و دەیگوت
چەند بەختەوەرە ئەم مانگایە
سەری شۆڕکردۆتەوە و گیا دەخوا و باکی بە تێکشکاندنی زمان نییە
ئەلفوبێی کەسکە و شینیی ئاسمان و شینیی مەرەکەب
تەنانەت حەبباری دەریاش ناناسێت
ڕووناکی تەنیا لە بریسکەی قەرسیلدایە و
ئاوڕ لە کونە ڕەشەکانی گەردوون ناداتەوە
بــاکی بە دەســەڵات نیــیە و ســەتڵە شــیرێک بە نــاوی وەرچەرخانی مێژوو نافرۆشێتەوە
باکی بە نەمریی و وەهمی زیندووبوون نییە
بێئاگایە لەوەی گەر بکەوێ چەقۆ زۆرن.

ژیـــان نـــاگۆڕێ لەگەڵ خەونەکـــانی بگونجێـــت، خەون
دەگۆڕێ لەگەڵ ژیانی تەبا بێت
سەری شۆڕکردۆتەوە و گیا دەخوا
وەک ئەوەی دنیا ڕامووسێ چاوی نووقاندووە و بە لەزەتەوە
گیا دەخوا
بەختەوەرە شاعیر نییە و ئەو ژنە ناناسێت
ئەو ژنەی زمان و ڕێزمانی تێکداوە
لە سینگیدا دوو بزوێن لە تەنیشت یەکن.

## هێزی ڕاکێشان

بە داخەوە ئەم وشەیە نەچۆتە ناو هیچ گۆرانییەکەوە
ئیشم بە وشەی موگناتیسە
چونکە دڵی تۆ ئاسنە ئاسن.

## نوقڵ

دەگێـڕنەوە بەیـانییەک لەبەر هەتـاوی دوای تاوەبـاران، ئەو ساتەی مێرووولە باڵدارەکان لەناو گیـای بریسـکەدارەوە دێـنە دەرێ، دایکـت قـژە درێژەکەتـی شـانە دەکـرد، مەحـوی گوتەنی ئەو قژە درێژەی ئیشـی ئێمەی لە کـورتی بـڕیەوە..
ئەو مووانەی لە شـانەکە بەردەبـوونەوە، مێرووولەکـان ڕیزیـان دەبەست و وەک زەخیرەی زسـتان بـۆ شـارەکەی خۆیانیـان دەگواستەوە.

نـاگێڕنەوە، خـۆم دەیـزانم ئەوانەی دەتناسـن چەنـد بیـرت دەکەن، بەس من جیام، تەنـانەت بیـری کۆڵنجیشـت دەکەم، کە شوێنێکە هەموو ئەوانەی دەتناسن بیریان نییە.

ئەرێ تۆ و تووتن لە چیدا یەک دەگرنەوە؟!

بۆ ئەوەی بتـوانم نەتبیـنم، وەک ئەوانەی جگەرەیـان تەرک داوە

بەم عومرەوە گیرفانم پڕ دەکەم لە بنێشت و گوڵەبەڕۆژە.

## مەجنوون

ناوت یەکێکە لە ناوەکانی شەراب و سەردەمی مەستان بەسەرچوو
هەموو ئەندامەکانت بە هەدەری لەزەت دەبەن، من ئەم دنیایە بناسم تەنها چاوت بۆ شەونخوونی جێ دێڵن،
هەنجیریت و کەس نەما شایەتی بۆ شیرینی بدا
پرچت ڕەشماڵی کوێستانیش بێت، ئەم ڕۆژگارە خۆی بۆتە حیجاب
ئاویش بیت کەس بەدیار هاوکێشەتەوە دانانیشێت و تەنیا دەیانەوێ فێری مەلە بن
لێرە قسە نێرە، جوانی بێوەژنی مێژووە، وشەکان بەردن و چاڵی ناوکت پڕ دەکەنەوە
قەڵەمەکان دەرزین و بە دەزووی مەجاز بۆشایی نێوان هەردوو مەمکت دەدوورنەوە
تازە ئەسپ حەیوانێکی نەجیب نەما، سواری فڕێ دا و مەجنوونەکانت لە بیابان سەرقاڵی دەرهێنانی نەوتن.

## پێناسە

شکست لەمە زیاتر چییە؟!

دانیشتووم و دەنووسم

لەکاتێکدا دەبوایە بڕۆم و بتدۆزمەوە.



## پەنجەرەیەکی کراوە بەسەر باخچەیەکی چۆڵەوە

کوا ئەو ژیانەی بە گوزەران لەدەستمان چوو؟!
**ت. س. ئێلیوت**

## وڵات

لە وڵاتێک ژیام

تیایدا تاکە پێشکەوتن پێشکەوتنی تەمەن بوو.

## ڕۆژهەڵات

جارێ ئەم وڵاتە باشە

ئێواران پەنجەرە دەکەینەوە هێشتا مانگیان نەدزیوە.

## کۆجیتۆ

لەم وڵاتە هەر کەسێک سەنگی هەبێت نقووم بووە

بۆ ئەوەی سەر ئاوکەویت

دەبێت تەرم بیت یان تەپەدۆر.

## باوەژن

دەڵێن نیشتیمان دایکە

بەڵام لەوەتەی دەیناسم ڕۆڵی باوەژن دەگێڕێت.

## جلێک بە ڕووتی

ئایدۆلۆژیا سەیرترین پۆشاکە

لەو کاتەی دایدەکەنیت

دەترازێنێتەوە.

## پاداشت

له هەموو خاکی ئازاد

هاوسەری شەهیدەکە

دوو بەردی بچووکی لەناو گورچیلەدا بۆ مایەوە.

## وەسڵ

ڕۆژی گەیشتنەوەی تەرمی منداڵە خنکاوەکەیان لە ئیجە
ماڵەکە
پسوولەی دوو مانگی ئاویشیان بۆ هاتەوە.

## دەمی ڕاپەڕین

دوای ئەو هەموو گۆرانییە بۆ ئاسۆی گەشی وڵات
بووینە ئەو پەنجەرەیەی لە حەوشەی پشتەوە دەڕوانێ.

## ئاسۆ

خوێن ئاسۆیە و لمیش ڕێمە

شمشێر پێش قسە کەوتووە و داروپەردوو ڕێگە و جێمە

بیناسنەوە

ئەوەتا

ئەوەتا سەردەمی ئێمە.

## قافیە

سەردەمی قافیەش نەما، لەنگیی ژیانمان

ڕێگا ونەکان، خەونە کێویەکان، قسە لەنگەکان ڕێکخاتەوە

بە ناوی داستانەوە بووینەتە حیکایەتێک کە بۆ لایلایەش

دەست نادا

ئاوێک پەیداکەن لەناو بتلّێکدا نامەیەکمان پێ بگا

ئەبەدیەتیش بووە قسەی ناو کتێبان.

## کۆمیدیا

شاعیرەکان ڕاهاتوون لەوەی خۆشییەکانی زمان
دەرەقەتی ناخۆشییەکانی مانا نایەن
من دڵم لای هونەرمەندانی کاریکاتێرە
چۆن بتوانن تراژیدیا ویّنا بکەن
لە کاتێکدا واقیع خۆی بۆتە نوکتە؟!

## خەبات

ئای چەندە بێسوود بوو خەباتت ئینسان

فەرموو بەردیش هەژار و دەوڵەمەندی هەیە

هەندێکیان دەبنە کێلی قەبر و

هەندێکیان دەبن بە مانگ.

## ملوانکەی ئەفسوناوی

لە تەمەنێکدا زۆربەمان پلانێکی لەم شێوەیەمان هەبووە

وەکـــو هەزار و یەک شـــەوە، لە لاپەڕەی چیرۆکێکـــدا

ملوانکەیەک بدۆزینەوە

کە لە ملمان دەکرد دیار نەدەماین

ئەوسا خەونەکانمان پەیوەندیی بە جوانی و خۆشییەوە هەبوو

کەس نەیـــدەبینین و دەچـــووینە ســـەر دیـــواری مـــاڵە

دەوڵەمەندەکان و بە دڵی خۆمان هەرمـێ و لالەنگیمـان لـێ

دەکردەوە

لە دەلاقەی حەمامەوە تەماشـای ژنە جوانەکـانی گەڕەکمـان

دەکرد

پارەمـان لە مـاڵە بەعسـی و جاشـەکان دەدزی و بـێ ئەوەی

کەس بمـانبینێ لەژێـر نیمـدەرەی خێزانـی ئەو پێشـمەرگانە

جێمـان دەهێشـت، کە لە شـاردا وەکـو پشـیلە هەر شـەوەی

منداڵەکانی لەژێر قادرمەی ماڵە ناسیاوێک دەشاردەوە

ئێستا ئەگەر ئەو ملوانکەیەمان هەبێت، هەر شەوە و یەکێـک

لەو خەباتگێڕانە لە باوەشی ژنە تازەکەیدا سارد دەکەینەوە
ژنەکـان، مێردەکانیـان و پیاوەکـانیش مێـردی دۆسـتەکانیان
دەکوژن
ئای نیشتیمان
چۆن لە خەونی خواردنی دوو هەرمێی بەلاشەوە
خەریکە هەموومان دەکەیتە بکوژ.

## شوکرانە

باش ژیاین

پـــێش مـــردن هەمـــوو ئەو شـــتانەمان دەســـتکەوت کە نەماندەویست.

## شوێندەست

تەسجیلەکە دەکوژێنمەوە

سەیری تابلۆی هەژاری دەکەم

دیوی دەرەوەی جامی سەکنی سەیارەکەم

پڕە لە شوێنەواری دەستی بچووک بچووک.

## هاڕین

ئەو منداڵە کارتی مۆبایل دەفرۆشێ
تینوێتی و خنکانی لە تێکستێکی بچووکدا کۆکردۆتەوە
خوشکەکەی بنێشتی سەهمی لە دەستە و
لەوە بچووکترە تێبگا
سەردەم سەردەمی هاڕینە نەک جووین.

## حەجەری

دانیشتووە سواڵ دەکا و

سەموونێکی حەجەری لە دەستایە

لەگەڵ هەموو گازێکی بچووک

پیتێک لە وشەی بەشەریەت دیار نامێنێ.

**موتەنەبی**

ئەو کچە عەرەبە بە فرمێسکەوە

بە زمانێک دەپارێتەوە هی بیابانە

لە یەک ڕوخساردا سەراب و ئاوی کۆکردۆتەوە.

## ئیسکان

وەک هەنگوینێک هاوسەرگیری لەگەڵ خوێدا کردبێ
ئەو منداڵە سینییەک نەهامەتی لەسەر سەرە و
خەڵکیش وەک پاقلاوە دەیبینن.

**لایلایه**

دوای ناشتن

به شوێن منداڵەکە گەڕاین

هەموو شوێنێکمان پشکنی

لە کانتۆری جلەکاندا دۆزیمانەوە

تـاکی ئەو گـۆرانییەی بەسـەر خۆیـدا داخسـتبوو کە تەنهـا

دایکی دەیزانی.

## تەسجیل

هاوڕێکەم دەیگێڕایەوە
لە گەنجیدا لەبەردەم ئاوێنە دەوەستا و
لەگەڵ گۆرانییەکدا دەمی دەجوولاند و بە تەواوی خۆی لێ
دەبووە ئیبراهیم تاتلیس
کاتێکیش براکەی کتوپڕ تەسجیلەکەی دەکوژاندەوە
هەستی بە چ نائومێدیەک دەکرد
بەو یادەوەریانە دەڕۆیشتین و پێدەکەنین
کتوپڕ کچۆڵەیەک داوای کڕینی جووتێک گۆرەوەی لێ
کردین
ئەمجارەیان تەسجیلەکە لە هەردووکمان کوژایەوە.

## جادەی کاوە

باران بوو

لەبەردەم دەرابی دوکانێکدا

لەژێر عەبادا

منداڵەکەی توند لە باوەش گرتبوو

نەبادا لەم ژیانە سوێرەیدا وەکو خوێ بتوێتەوە.

## مەنزڵ

ئەوەی ئێواران سەیری تەلەفزیۆن بکا
تێدەگا ئەم نیشتیمانە لە بتی خورمای سەردەمی جاهیلی
دەچێت
بە شەو دەیپەرستن و بە ڕۆژ دەیخۆن
موتەنەبی ڕاست دەکا
وَمَنزِلٍ لَيسَ لَنا بِمَنزِلِ.

## هەڵبژاردە

لێرە گەر بتەوێ بڕوانیت

نیتە پەنجەرە و پەنجەرەیەکی تر

هەتە دیوار و دیوارێکی تر

تەنیا لە نێوان ئەزیەت و ئەزیەتێکی تردا هەڵبژاردنت هەیە

لێرە سەرەکان بێ ئەوەی بەرد بن

زۆر شت دەهاڕن بێ ئەوەی گەنم بن.

## ڕاو

ئەو هەموو قولابەمان هەڵدایە ئاوی ماناوە
بێجگە لە پارچە تەختەی کەشتیی نقوومبووی خەبات و
پیتی ژەنگاویی مێژوو و خۆری کەوتووی سەر بەیداخ و
تەنەکەی ئەمارەتەکان
هیچمان نەگرت.

## بووکی ئازادی

ئەو هەموو نێرینەییە

ئەو هەموو دوژمنە

لە سایەیانەوە

بووکی ئازادیی قانع بێوەژنە.

## تۆڵە

لە ناوەڕاستی شەقامدا
شێتەکە بە جنێوەکانی
تۆڵەی منیشی لە دنیا دەکردەوە.

## تامێکی دوور

لەبن قەڵاتی هەولێر
عەرەبانەی لوقمفرۆشەکە غلۆر بۆوە و
منداڵیم گرتیەوە.

## خەلیفە

لەوەتەی بوونم لە شێوەی جەستەدا خۆی نواندووە

مردنی بە زەماوەندەوە منم

داروپەردوو بناغەمە

ئاهی تووراوەی ناو ئاتوونم

پێیەکان بەسەر مندا ڕادەبوورن

ڕۆمییەکان، عەجەمەکان، عەرەبەکان

چاڵی چاوم، چاڵی دەمم شوێن پێی خۆیان و ئەسپەکانیانە

برۆم تاقی سوپایانە بۆ شاری سەر و شاری ناخم

شنە بووم و لە لافاویان مارە کردم

هەور بووم و بە زنجیری برووسک بە بیابانیان بەستمەوە

من و زمانیان بەیەکەوە ڕووت کردەوە

پێستی بە هەتاو ڕەشهەڵگەڕاوم کرایە عەبای خەلیفە

ئێسقانی ئەبجەدییەتیش لە نزیک شەنگال بە پەرتوبڵاوی

دەبریسکێتەوە

کەسێک بابێت، شاعیر بێت باشترە

چاڵەکانم بە شیری گوڵگەنم پڕکاتەوە

بە پارچەیەک جەمەدانی برینەکانم پینەکا

بە توێکڵی گوێز باشترە

تا لەسەر پێستە تاریکەکەم نەبێتە ماک

شایەتێک بێنن بە ئاواز دامپۆشێت

من مێژوو بناسم نامکەنە گۆرانی.

## پلیکانە

ئەو هەموو چیایەمان هەبوو مووسایەک نەچووە سەری
ئەو هەموو لافاوە هات و نووحێک دەربازی نەکردین
ئەو هەموو شاعیرە و ئاگرێکمان پێ نەدزرا
سکمان بە پێمان نەسووتا
بەدیار پارچەی شکاوی ئەو پلیکانەیە دانیشتووین
کە بڕیار بوو بەرەو فیردەوسمان ببات.

## نوێخوازی

چیتر گلەیی لە قسەی کۆن ناکەم
تازەگەری لە کوێ بێنین
لە ڕۆژگارێک هەموو ڕۆژەکانی دووبارەن.

## موکەبیرە

نەغمەی پاڕانەوەت لە دنیا تەرکدە

ئەمە مێژووە دەڕوا جەنازە نییە

ئەی ئیمام بڵندگۆی منارەت بکە دووکەڵکێش

بۆ ئەو ئاگرەی لە هەناوماندایە.

## لافاو

ئەم هەسارەیە
تا دێ نەک گەرمتر
غەمگینتر دادێ
سەد بارتەقای بەستەڵەکەکانی باکوور
خەونەکان تووانەوە.

## پەیکەرتاش

بێزار نەبووی لە هەڵخستنی نووزانەوە بەسەر تەنافی سۆزدا؟!

گوێت لە هاڕەی ئەبجەدییەت نییە لەژێر باری بیرۆکەدا؟!

کەی کاتی دێ ببیت بە پەیکەرتاشی بێدەنگی؟!

## داڵ

دراوسێ مردووەکەمان خێرا شاردەوە
داڵی سەر لۆگۆی حکوومەت
بە چاوی برسییەوە دەیڕوانییە بەهەشتەکەی.

## تەشریفات

پیرێژنەکە

لەبەر خاتری کوڕە ئەنفالکراوەکەی

هەموو سبەینان لەسەر تەنافی حەوشەیان

درۆی تەڕی ڕۆژنامە حزبییەکانی هەڵدەخست.

**میوە**

ئەو سێوە زەردەی بە دیار هەواڵەکانەوە دەمخوارد
سوور هەڵگەڕا
ئەی منداڵی ژێر داروپەردوو
تۆ ئێمەیت
کۆی لە شێوەی تاک..

## شوان

به ڕۆژ له شاردا ئاخه‌كان به‌رز ده‌بنه‌وه
شه‌وان ده‌بنه‌ هه‌ورێک
سه‌گه‌ به‌ڕه‌ڵاكان به‌ره‌ و به‌رزایی شاخه‌كان ڕاوی ده‌نێن.

**بیانوو**

زمان نایەوێ باوەڕ بکا

کە ڕۆژبەڕۆژ بیانووی بێدەنگبوون زۆرتر دەبێ.

**ڕێژەیی**

ئەو بیرۆکەیەی دەمانباتە سەر ڕاستییەک

ڕاست نییە گەر نەمانباتەوە بۆ ونبوون

پیرۆزبایی لە گومان بکەن کە دەتوانێت

ماڵ و چۆڵەوانی

مادده و غەیب

لەسەر یەک خوان کۆکاتەوە.

## لۆچ

هەندێ شت مردوون بەڵام جەنازەیان نییە

لەوانە: دادپەروەری

هەندێ شت زیندوون بەڵام جەنازەیان هەیە

لەوانە: هەژاری

ئەی هەژاری

ڕەوا نییە بەردەوام لۆچ دەبەخشی و

ئێمەش یەک ڕوخسار شک دەبەین.

## هەنگاو

چ نەزانـێکە پێـی وایە بە پەڕۆی لافیـتە ئەو هەمـوو بـرینە
بپێچێتەوە؟!
چ چاو قایمێکە داوا لە نەوەکان بکا ڕێک بڕۆن
لە وڵاتێکدا کە خۆی دەشەلێ؟!

## ئاینده

کۆچ دەکەن چونکە مێژوومان سوورە نەک ڕوومان

لێرە ئاینده ناژمێردرێ

ناگەیتە دە، ئاینده دابەشت دەکا

لە ڕۆژهەڵات

هەموو شتێک هەڵدێ ڕۆژ نەبێ.

## فیرعەون

لەبەردەم مزگەوتی گەورە

لە تەنیشتی دانیشتم تا پەتی تەسبیحەکەم بۆ بگۆڕێت

بە پیرەمێردێکی دەگوت

یوسفی ناوێ بپرسی و خەون لێکداتەوە

هەر کاتێک بەرپرسێکی ورگنت بینی لە تەلەفزیۆن قسە دەکا

بزانە یەکێکە لە مانگاکانی خەونەکەی فیرعەن و

قاتوقڕی بەڕێوەیە.

## ئیسراحەت

فرۆید ڕاست دەکا، نیشتیمانی یەکەممان لەدەست دا

گریانی لەدایکبوون، پەشیمانبوونەوەیە

ئای، سکی دایکمان

لە دوای ئەم گەشتە دژوارەی دنیا

لە ئیسراحەتی گەیشتنەوە ماڵ دەچێت.

# ناوی تۆ

# ئیمزای منە

هەمیشە ئیرەییم بەو پیرەمێردەی دراوسێمان بردووە..

تووشی لەبیرچوونەوە بووە و

هەموو خەڵک، بە مەلای گەڕەکیشەوە

بە ناوی ئەو ژنە بانگ دەکا، کە خۆشیدەویست.






فام
دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication